# بێکەس

## پیاوێك لە ڕەنگی نیشتیمان



نیگاری: جەزا بەکر

ڕۆڤار
35
بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە و هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەریدەکات




سەرپەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

ڕاوێژکار

ئەکرەم قەرەداخی

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەر

یادگار ئەوڕەحمان

سەرپەرشتیاری چاپ

فەرهاد ڕەفیق

(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە دامێنەرێك، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دوو مانگ جارێك دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی - فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار

ت: ٣١٢٠٦٩٠

لە دەرەوەی وڵات

Tel: 00441628477660

Fax: 00441628486008

Web Site

www.sardam.info

Email

Sardam@sardam.info



چاپخانەی: (ڕەنج)


## شێوەکار جەزا بەکر



١٩٦٢ لە سلێمانی لەدایکبووە. ١٩٨٨ ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانی بەغدای تەواوکردووە. ئێستا مامۆستایە لە کۆلێژی هونەری زانکۆی سلێمانی. ئەندامی گروپی هاوڕێیانی شێوەکارە. ئەندامی یەکێتی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستانە.

**پێشانگەی تایبەتییەکانی:**

١٩٩٤ پێشانگەی (کەڤاڵی چیا)، ٢٠٠٠ دووەمین پێشانگای تایبەتی سلێمانی.، ١٩٨٢ هۆڵی سورکێو.، ١٩٨٩ پێشانگەی پێشکەش بە پایزی شارەکەم/ سلێمانی.، ١٩٩١ پێشانگەی ئاوازو ڕەنگی پایز سلێمانی/ هەولێر.، ١٩٩٢ هونەرمەندانی کورد/ شاری گراتس- نەمسا.، ١٩٩٢ پۆستەری تایبەت بە ژیان مندالی کورد/ سلێمانی/ سوید/ ئەمەریکا.، ١٩٩٢ یەکەمین پێشانگەی لاوان/ خەڵاتی ڕێزلێنانی وەرگرتووە.، ١٩٩٤ یەکەمین پێشانگەی هاوڕێیانی شێوەکار/ سلێمانی.، ١٩٩٧ هەشتەمی هونەرمەندانی سلێمانی.، ١٩٩٧ پیشاندانی کارە هونەرییەکانی بەسلاید لە ئەکادیمیای (ئۆتریخت) لە هۆڵەندا.، ٢٠٠٠ پێشانگەی (ملوانکەی چیا) لە(مسلاوس)و (فلاردینگن)ی هۆڵەندی.

# ژمارەکانی ڕابردوو

ئیبراهیم ئەحمەد، محەمەد مەولود (مەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارەی ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هەردی، یەڵماز گۆنای، موحەڕەم محەمەد ئەمین، دڵدار، مەستوورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە سالّح دیلان، هەژار، شاکیر فەتاح، عەلائەدین سەجادی، پێشەوا قازی محەمەد، مەحمود مەلا عیززەت

# بەیادی (بێکەس)ی گەورەدا!



■ شێرکۆ بێکەس

سروشتی ئەو رۆژەی تیامردی وەك ژیانی خۆت بەژەنگ و ژارو دژواربوو! بەیانییەکی بەکرێوەو تۆف و زریانی ئەوتۆ کە (هەڵەبجە)ی وەك باڵندەی لەباڵ کەوتووی ناو شەختە سرِوکەسیرە کردبوو. ساواق بوو ساواق. ئەو گڤەگڤ و باپوسکانە تووڕەبوونی شیعرو نرکەی هەڵوێستەکانی تۆیان ئەگێڕایەوە؟! یان دەنگی شین و شەپۆری ئەوان بوو لەناو کۆتەڵی باخی میری پەژموردەو لەبەردەم (کانی عاشقانی) پەشۆکاودا؟! تەمەنێکی کورت. بەڵام درێژ بەئازارو بەسەرهات. درێژ بەورەو، درێژ بە برسێتی و بەزیندان و دەربەدەری و دیسانەوە کورت بە خۆشی و زەردەخەنەو کورت بەگیرفان و ماڵ و حاڵ و پۆشاکی جوان. هۆدەو هەیوانێك و بەڕەیەك و چەند کتێبێك و دوای مردنیشت، جزدانێك بەشەش حەوت پەنجایی و دەدوانزە فلسەوە میراتی تۆ بوو بۆ بێوەژنێك و من و دوو خوشکی سەرگەردان. بەڵام میراتی راستەقینەت، ئەو شیعرە دلاوەرو زەنگ بەدەستانە بوون کە لە سەردەمی تاریکستانی هۆش و گۆشدا لەناو دڵی ئەم شارەدا بەردەوام ئەزرنگانەوەو ئەبوون بەپەیام و سروودو بە بازرەقەی نەبەزین و کڵپە کڵپی لەژیان. تۆ هەر شیعری رووت نەبوویت، هەر زمانێکی تەنیا نەبوویت و ئاوازێ نەبوویت بۆ ژورێك و بۆ هەڵبژاردەیەك و تەواو، تۆ شیعر بوویت تێکەڵاو بە بڵێسەی راپەڕین، زمانێك بوویت تێکەڵاو بەزریان، ئاوازێ بووی ئاوێتە بەڕۆحی داستان. تۆ شاعیر بوویت و ئینسان. خەمی تۆ گۆشەگیرو لاتەریك و نائومێد نەبوو. خەمی خۆت دواخەم بوو ئاوڕی لێبدەیتەوە. تۆ بۆ (بێکەس)ی خۆت نەژیایت، ئەوە بێکەسیی نەتەوەکەت بوو ئەیکردی بەمەشخەڵان. تۆ لە شەشی ئەیلول دا تەمەنت بیست و پێنج ساڵان بوو نەختێ بووی بە سەرکردەی هاواری شەقام و بەردەرکی سەراو بازاڕو بۆ یەکەمجار شارت هەژان. تۆ (وەتەن)ت بەگوێچکەکانی دڵتا هەڵواسیبوو. لەگەڵ خۆتدا ئەتبردە زیندانەوەو ئەتبردە مەنفاو لەناو شیعرا ئەتتوانەوەو ئەتکرد بەکۆت و زنجیری دەست و قاچت و بەئازارو شەونخونی و لەسەدلاوە: لەهەژاری و نەبوونی و بێ ماڵی و قەرزاری و بێدەرەتانییەوە شاڵاویان بۆ ئەهێنایت و بەڵام تۆ سەرت هەورێك بوو پڕ لەچەخماخەو هەتا مردن داتنەنەوان. تۆ شیعرت کردبوو بەئاوری ناو زمان. بەپشکۆ ئەتنووسی. بەدەمی تیژی شیری رستە، بەتیری رەخنەوە کۆمەڵت دائەچڵەکان، ئەتنووسی وەك نمە نمی باران و تریفە نا. وەك گوڵێکی ناسك و پەپوولەیەك نا. بەڵکو وەك رەشەبای تووڕەو گەرداوێك و سوورە هەتاوو چون هەڵۆیەك لەشەقەی باڵت ئەدا. بەلای تۆوە هونەر هەر جوانی و ناسکی و فۆرمێکی رازاوە نەبوو. هونەر بەلای تۆوە لەکاکڵدابوو، لەو هەوێنەدا، کە راستەوخۆ خەڵکی لەبونیادی بگاو لەو ئاگرە سوورەیشدا کە دوژمن لێی ئەترسا!. مەراقەکان زۆرو کۆمەڵ ئالوودەی دێوو درنج و زانست مۆمێکی زۆر کزو هۆشیاریی ئێجگار تەنك و پارەوپوول هەموو

شتێك و هاوارەكانت ون ئەبوون و چاوت لێ بوو پەیڤەكانت (با) ئەیانبا. بۆیە ناچار خۆت ئەدا بەدەم بادەوە بەدەم سەرخۆشی و بێهۆشی و سڕبوونێكی بەئەنقەستی شەوانەوە كە وەختێكیش ئەگەیشتە سەر ئێسقانت ئیتر ئەوسا تۆ جنێوت بە عەرش و قورش و بەكوردو باوكی كوردو دنیا ئەدا.. هەر وەكو (گۆران) وتەنی تۆ وەهابووی، (كەشتیەكە گەرداو ئەیبردو كەسیش نەبوو ڕێی ڕاست بگری). تۆ پەیڤی سەردەمی خۆت بوویت. دەم و چاوو ئاوێنەیش بوویت. خۆت رەفتارو خۆت كردارو هەر هەمان سات شایەتیش بوویت. قسەی دڵت و قسەی دەمت و وشەی سەر كاغەزت یەكبوون. بێ دەمامك بوو رووخسارت و بێ رووپۆش بوون شیعرەكانت و، وایش ئەژیایت. لەنێو رووناكبیرانی ئەو رۆژگارەدا تۆ پەیكانی رووبەڕووبوونەوە بووی لەگەڵ دەستەڵاتداران و داگیركەراندا، ئەچوویتە ناو ئاگرە سوورەكانەوە، نەك هەر دەستت بە كڵاوی خۆتەوە نەئەگرت، تۆ لەو هەڵوێستانەدا (سەر)یشت لا مەبەست نەبوو. تۆ مێژووت دروست ئەكرد، وەختێ لەدووریانە مەترسیدارەكاندا كەڵ مل رائەوەستایت و خۆت چیت بویستایە وات ئەوت. ئازادی لە كوێ بووایە تۆیش لەوێ بوویت. شار هەتا ئێستەیش بەدەنگی بەرز سروودەكانی تۆ ئەڵێتەوە. هەتا هەتایە هەندێ چریكەی تۆی لە گوێدا ئەزرنگێتەوە، وەك چریكەی ٢٧ ساڵەكەت كە لەنەورۆزی ١٩٤٦داو لەگردی مامەیارەو لەبەرچاوی سەدان كەس رووبەڕووی (ئەدمۆنس)ی موستەشاری ئینگلیز، گەورەترین دەسەڵاتداری ئەوسای عێراق بێ دەربەستانە خوێندتەوە. (ئەدمۆنس) ئەو پیاوەی تەنانەت كەم كەس ئەیتوانی قسەی ئاساییشی لەبەردەمدا بكات! نەك پەنجە بكات بەچاویاو دایشۆرێ و بیكا بەجرج!.

تۆ بەتەنها بریتی نیت لەكۆمەڵێ شیعری ئاگرین. تۆ ئەو گفتارانەی كە لەمەیدانی كاری بەرچاودا بەرجەستە بوویت. تۆ لەبەردەم منداڵێكی كورددا سادەو ساكارو بەڵام لەبەردەم گەورە پیاوانی میری و هێزی دەسەڵاتداران شكۆو هەیبەتی شاخێكی بەرزو خۆ ڕاگرت هەبوو. ئەوە من نایڵێم، شەقامەكانی شارو ئاپوورەی بازاڕو زەنگی قوتابخانەكان و رۆحی مامەیارەو، بەفری گوێژەو پیرەمەگرون ئەیڵێن. ئەوە من نایڵێم، مێژوویەك ئەیڵێت كە تۆ خۆت مەشخەڵێك بووی لەمەشخەڵەكانی. شیعری تۆ پەیام و هاوارو هەڵوێستەكانت بوومەلەرزەبوون. تۆ لەڕێبازی شیعری وردەكاری هونەری و سنعەتی لەفزیدا نەبوویت. تۆ بەتێڕوانینێكی میللی تازەوە، ڕێچكەی شیعری نیشتمانی و كۆمەڵایەتی حاجی قادری كۆییت گرتەوەبەر. ئەو شاپلیتەیەت ئاگردایەوە كە حاجی لەسەردەمێكی زووتردا بۆ یەكەمجار بەو تین و تاوەوە ئاگری رۆحی خۆی پێوەنابوو. تۆ سەرلەنوێ و هاوچەرخانە هەڵتكردەوەو درێژەت بە كڵپە كڵپی دایەوە. لەناو دیوانە تاقانەكەتدا، زۆرن ئەو شیعرانەی كە بۆ نیشتمان و كۆمەڵ و دەرەوەی خودی خۆتت وتون. بەڵام ئاوێنەیەكیان لەهەموو ئاوێنەكانی تر زیاتر خودی تۆمان نیشان ئەداو لەهەموویان زیاتر تۆمان لێ نزیك ئەكاتەوە. پارچە شیعرێك پوختەی جەوهەری تۆیە. ئەگەر لێم بپرسن: بێكەس كێیە؟! راناوەستم و ئەڵێم ئەم شیعرەیە:

**من كە رازی بم بەنەختێ عەرەق/ بەچۆرێ شۆرباو لەتێ نانی رەق/ كەڵكەڵەی پارەم لەسەردا نەبێ/ حیرسی تەماعم دابێتە بە شەق/ سەر بۆ هیچ كەسێ دانانەوێنم/ تەشی نارێسم بۆ پیاوی ئەحمەق./ بەنێری ئەژیم هەتاكوو ماوم/ ئەبەد لانادەم لەسەر ڕێگەی هەق!.**

لەناو كۆمەڵیشدا تۆ هەڵەو خەوش و نەریتە دواكەتووەكانت ئەدایە بەر بەردی رەخنەو بازرگان و مشەخۆرو شێخ و حاجی و مەلای پارە پەرست و چاوچنۆك و كۆیلەكانی خورافات و كۆنخوازت رسوا ئەكردو بێ پەردە رووبەڕوویان ئەبوویتەوە: تۆ لەو شاعیرانە بووی كە لەڕێی تەنزو گاڵتەوە ئەتویست خەڵكی راپەڕێنی و لە بێ هۆشی و پاشكەوتوویی بەئاگایان بێنیتەوە. تەنانەت هەندێ جار بەنووكە خەنجەری بێ بەزەییانە ئەكەوتیتە جەستەی هەمووان و بەتوندی دەستت ئەوەشان و هەرچی شتی شاراوەی ژێر بەرە هەبوو كە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ (شەفافیەت) ئەتخستە سەر بەرەكەو ئەتوت:

**كورد ئەبەد ناگاتە مەقسەد نۆكەری بێگانەیە/ دووەڵ پیسن لەگەڵ یەك، بۆیە وابێ لانەیە./ میللەتێكن بۆ نەمانی یەكتری هەر هەوڵئەدەن/ داخەكەم وردو درشتی شێت و شەیدای ئانەیە!**

لەساڵیادی پەنجاو شەشەمین كۆچی دوایی تۆدا هەموو ئەو بیرەوەری و یادگارانەی كە منداڵێكی هەشت ساڵانە لەزەینی تیژو دڵی بچكۆلەی خۆیدا گلی داونەتەوە. لەشێوەی بینینی چەند خەونێكی ڕووندا دێنەوە پێش چاوی: بۆ یەكەمجار كە دەستت گرتم و لەپۆلی خوێندندا داتنام. بۆ یەكەمجار كە شیعری (تۆ چیت! من كوردم)ت پێ لەبەركردم. كە لەتاقە ژوورەكەماندا لەسورداش و هەڵەبجە. شانت دائەدایە سەر سەرینەكەت و كتێبت ئەخوێندەوە. ئێستەیش وێنەی هیلالی سەر كتێبێكیانم هەر لەبەرچاوە كە دیارە دواتر زانیم ئەوەیان گۆڤاری (الهلال)ی میسری بووە. لەساڵی ١٩٤٧دا كە لەسلێمانیەوە بە پاسێكی تەختە بەرەو سورداش ئەگەڕاینەوە لەگەڵ مەلایەكی ناو پاسەكەدا مشت و مڕتان بوو. نەمئەزانی چی ئەڵێن، بەڵام دوایی دەركەوت و زانیم ئەو دەمەقاڵێیە شیعری (ئەی مەلا تووبی خودا لەم فیكرە كۆنەت لابدە)ی لێ كەوتەوە. دوا شەوی ژیانیشت كە لەماڵەوە بوویت و دەرسەكانت بەمن دەورئەكردەوە. بۆ سبەی سەعات هەشتیش بەئێجگاری چاوت لێكناو هەر هەمان رۆژ بەرەو سەیوان بوویتەوە. لەئاپوورەی سەرقەبران و خەمی سەر دەم و چاوی وردو درشتدا، لەپرسەكەشتا هەر زوو تێگەیشتم من كوڕی پیاوێكی ئاسایی نیم. ئەی باوكی كوردان و من و هەموو ئازادیخوازان! لەبەیانی ١٢/١٨ی هەموو ساڵێكدا وەختێ بەرەو ژوور ئەڕوانم ئەبینم لەسەر تەوقە سەری گوێژە راوەستاویت و دەست رائەوەشێنی و لەسروودە نەمرەكانی خۆتمان بۆ ئەخوێنی!

٢٠٠٤/١٢/٩

# بێکەس لە چەند دێڕێکدا

رۆڤار

ناوی (فایق) و کوڕی (عبداللە بەگ)ی کوڕی(کاکە حەمە)ی کوڕی(ئەلیاسە قۆجە)یە. بنچینەی بنەماڵەیان لە قەڵاچوالانەوە هاتووەتە سلێمانی‌و، خۆی لە ١٩٠٥دا لە سیتەک هاتووەتە دنیاوە کە دێیەکە بیست کیلۆمەترێک لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سلێمانییەوە، ئەوسا مەرکەزی قەزای شاربازێڕبووە. عبداللە بەگی باوکی لەوێ(تابوور ئاغاسی)بووە. لە دایکیشیەوە لە بنەماڵەی ئاغەلەرەکانی سلێمانی‌یە.

ساڵی یەکەم و دووهەمی تەمەنی لە سیتەک بەسەربردووەو، پاشان ماڵیان هاتووەتەوە سلێمانی‌و. لە تەمەنی سێ ساڵانا ئاوڵەی دەرداوە. هەر بە منالی باوکی لە حوجرەی فەقێ خستوویەتیە بەر خوێندن لە١٩١١دا باوکی بە ئیشی میری نێرراوە بۆ خانەقی‌و لەوێوە بۆ بەغدا. لە بەغداوە ئەنێرێ بەدوای ماڵو منالەکەیاو ئەیانباتە ئەوێ و، پاش ساڵێک خۆی چووە بۆ تورکیاو ئەمانی لە بەغدا بەجێ هێشتووە. ئیتر فایق باوکی نەدیوەتەوە. هەر لەو ماوەیەدا حەمە سەعیدی برا گەورەی لەناوی دیجلەدا ئەخنکێ و دوابەدوای ئەو دایکیشی کۆچی دوایی ئەکاو فایق ئەکەوێتە لای خاڵی. ئەویش پاش چەند مانگێک ئەمرێ و فایق و تاهیری برا بچووکی بە بێکەس ئەمێننەوە.

کە شەڕی یەکەمی جیهان دائەگیرسێ و ڕێی هاتوچۆی نێوان بەغداو سلێمانی ئەبەسترێ، حاجی ئەمینی کاکە حەمەی مامی لە سلێمانی‌یەوە ئەنێرێتە لای حاجی عەلی ئاغا کە لە بەغدا بووە، کە چاودێریی فایق و براکەی بکاو هەر میراتێکیان لە باوک و دایکیانەوە بۆ مابێتەوە بۆیان خەرج بکا. ئەویش ئەیانداتە دەستی(حەبەخان) ناوێک کە خێزانی ئەفسەرێکی خەڵکی سلێمانی بووە لە بەغدا دانیشتووە. ژنەکەش مەردانە ئەیانخاتە ژێر باڵی بەزەیی خۆی و وردە وردە پێیشیان ئەخوێنێ. دوو سێ ساڵێک بەم جۆرە ڕائەبوێرن لە١٩١٧دا کەساسییەکی زۆریان تووش ئەبێ لە١٩١٨دا حەبە خان ئەیانباتەوە بۆ سلێمانی بۆلای حاجی ئەمینی مامیان.

فایق لە سلێمانی ئەخرێتە قوتابخانەو لە پۆلی سێهەما وەرئەگیرێ و تا ساڵی١٩٢٣ بەردەوام ئەبێ لە خوێندناو هەموو ساڵێ بە یەکەم دەرئەچێ لەوساڵەدا لەسەر ئارەزووی مامی ئەچێتە خوێندنخانەی(علمیە) لە کەرکووک، بەڵام بۆی ڕێناکەوێ لەوێ بخوێنێ، ئەچێتە بەغداو ساڵی١٩٢٤-١٩٢٥لە (دار العلوم) بەسەرئەبا لەوێیش لەبەر دەم بزێوی ناتوانێ بژی و لە١٩٢٦-١٩٢٧دا ئەگەڕێتەوە بۆ سلێمانی لەوکاتەدا سلێمانی تەنها پۆلی یەکەمی تیا بووە، ناچار تێی ئەچێ.

لەو ساڵانەدا تەنگ و چەڵمەی ژیان ناچاری ئەکا دوکانێکی جگەرەچییەتی بکاتەوە، بەڵام ئەمەش سەرناگرێ و دەسئەکا بە جگەرەو شقارتە فرۆشتنی دەسگێڕو پاشان پەنا ئەباتە بەر(ئەشغاڵ) و بە ڕۆژانە لە ڕێگای عەربەت ئیش ئەکاو چەند مانگێک لەسەر ئەم ئیشە ئەبێ لە ١٩٢٨دا بۆ ماوەی چەند مانگێک لە هەولێر ژیاوە لەو سەردەمەدا خوالێخۆشبوو(قالەی ئایشەخان) ئەندازیاری ئەشغاڵ بووەو سەرپەرشتیی کردنەوەی ڕێگای هەولێر-ڕەواندز-ڕایاتی کردووە، بێکەسی دۆستی لە ئەشغاڵ دامەزراندووە هەر لەو ساڵەدا بێکەس ئەبێ بە مامۆستای(زانستی)و لە ١٩٢٩دا ئەبیسێ کە باوکی لە مەرعەش لە تورکیا مردووە. لە ١٩٣٠ بەهەر دەردی سەرییەک بووە بەدوای میراتی باوکیا ئەچێ بۆ تورکیاو هەر لەو ساڵەدا بە نائومێدی ئەگەڕێتەوە.

هەر لەو ساڵە دا بوو ڕاپەڕینەکەی شەشی ئەیلوول لە دژی هەڵبژاردنە ساختەکەی دامودەزگای پاشایەتی ڕوویدا بێکەس یەکێک بوو لەو نیشتمان پەروەرانەی سەرکردەیی ئەو ڕاپەڕینەیان کردو بریندارێشبوو تیایا لەئەنجامی ئەو دەورەیدا ئەیگرن و ئەیخەنە بەندیخانەوە شیعرە بەناوبانگەکەی(ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم..)ی لەو بەندییەدا وتووە، هەر لەسەر ئەم بەشداربوون و سەرکردەیی‌یەی لەسەر ئیشیش لائەبەن.

کەلە بەندیخانە دێتەدەرەوە قوتابخانەیەک ئەکاتەوە بۆ ئەوەی دەرزی تیا بڵێتەوەو پێی بژی لە١٩٣٣دا میری وەرینەگرێ بە مامۆستاو ئەینێرێتە مۆرتکەی بازیان و پاشان ئەینێرێتە تەوێڵە لە هاوینی١٩٣٥دا لەگەڵ کۆمەڵە مامۆستایەک کە یەکێکیان مامۆستا (گۆران)ی شاعیری بەناوبانگ بووە، بەشداریی لە دەورەیەکدا کردووە کە لە بەغدا بۆ مامۆستایان ئامادە کراوە بێکەس لەو سەردەمەدا مامۆستای قوتابخانەی سەرەتایی بازیان بووە.

لە ١٩٣٧دا لە وزەی میریدا نامێنێ مامۆستایەکی نەترسی وا لە سلێمانیدا هەبێ گیانی خەبات و کوردایەتی بڵاوبکاتەوە، دووری ئەخاتەوە بۆ حیللەو پاش ساڵێک ئەینێرێ بۆ عەمارە، بەڵام بێکەس قایل نابێ بچێ و دەس لە ئیشەکەی هەڵئەگرێ و دێتەوە سلێمانی، قوتابخانەیەک ئەکاتەوە تا ١٩٤١ دەرزی تیا ئەڵێتەوە. ئەوجا ئەیکەنەوە بە مامۆستای قوتابخانەکانی میری و، تا دوادوایی ساڵی١٩٤٨لە قەرەداغ و سلێمانی و سووڕداش و هەڵەبجە مامۆستا ئەبێ لە١٩٤٨/١٢/١٨دا بۆ یەکجاری سەر ئەنێتەوە.

بێکەس شاعیرێکی ئازاو نەبەزو چاونەترساو بووە. هەرگیز گوێیشی بە(پایە) و (شوێن) و دارایی نەداوە، تا ماوە بە سەربەرزی ژیاوەو، لە ڕێگای دڵسۆزی بۆ گەل و نیشتمان لاینەداوەو، ژیان و شیعری خۆی بۆ خزمەتی ئەوان تەرخان کردووە چەند جار ئینگلیزەکان ویستوویانە بە تەمای پایەی(بەرز) لە خشتەی بەرن یا هەر هیچ نەبێ دەمکوتی بکەن. بەڵام ئەو گوێی نەداونەتێ و بە هیچ نەخەڵەتاوەو لە هیچ نەترساوە گرتن و دوورخستنەوەو لەسەر ئیش لابردن با وەڕی بە نەتەوەو وڵاتەکەی لەقنەکردووە نموونەیەکی هەرە دیاری ئەم چاونەترساوییەی بێکەس، پارچە شیعری(بیست و حەوت ساڵە)یە کە لەئاهەنگێکی ماڵاواییدا، کە لە ساڵی ١٩٤٦دا مەعرووف جیاووکی موتەسەڕڕیفی ئەو سەردەمەی سلێمانی، بۆ (ئەدمۆنس)ی ڕاوێژکراوی ئینگلیزی وەزارەتی ناوخۆی سازکردبوو، ڕووبەڕووی ئەدمۆنس خۆی و بەرابەر بە صەدان کەس لە نوێنەرانی هەموو چینەکانی خەڵکی سلێمانی خوێندیەوە، لەکاتێکا کە ئەدمۆنس هەموو شتێ بوو لە عێراقاو، کەم کەس ئەیوێرا قسەی عادەتی لە ڕوویا بکا.

بێکەس وەنەبێ نیشتمان پەروەرێکی دوورو بێئاگا بووبێ لە هەڵسووڕانی ڕێکوپێکی سیاسی بە گوێرەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لەم ڕووەوە کراون لە جووڵانەوەی(ژ. ك) و دوابەدوای ئەو لە دامەزرانی(پارتی دیموکراتی کوردستان) زۆر نزیك بووە. پارچە شیعری(داری ئازادی)یش کە دوابەدوای ڕاپەڕینەکەی ١٩٤٨ی گەلی عێراق وتوویەتی و لەوانەیە دوا شیعریشی بێ، بەڵگەیەکی بایەخداری نزیکییەتی لە بیروباوەڕی دیموکراتی...

بێکەس جگە لە زمانی کوردی، عەرەبی و فارسی و تاڕادەیەك ئینگلیزیشی زانیوە. بەتایبەتی لە عەرەبیدا دەسێکی باڵای بووە. هۆنرا وەیەکی زۆری عەرەبیی لەبەربووە. وابلاوەکە(معلقاتی سبعە)ی بەتەواوی لەبەربووە.

قسەی خۆش و نوکتەو گاڵتەوگەپی بێکەس لەناو کۆڕەکانی ئەو سەردەمەی سلێمانیدا باو بووەو، ئێستاش ئەیگێڕنەوە. هەرگیز بۆ وەڵام دانەوەو قسەی بە توێکڵ دانەماوە.

لەناو شاعیرانی کوردا ئەحمەد بەگی ساحێبقران(حەمدی)و، لەناو نیشتمان پەروەرانی کوردستانا(مەحموود جەودەت)ی زۆر لا پایەبەرز بووە. جەودەتی شەهید یەکێك بووە لە دۆستە خۆشەویستەکانی.

بێکەس دوو ژنی هێناوە یەکەمیان لە ساڵی١٩٣٥دا کە پاش ساڵێ بە دەردی سیل کۆچی دوایی کردووە و مردنەکەی کارێکی زۆری کردووەتە سەر دەروونی بێکەس و وای لێکردووە ماوەیەك گۆشەگیر ببێ. لەم ژنەی کچێك و لە ژنی دووهەمی دووکچ و کوڕێکی بووە کە(شێرکۆ)یە.

وەکو ئێستا دەرئەکەوێ بێکەس بەتەوژم(زەغت)ی خوێن مردووە. لەگەڵ ئەوەشا کە لە ڕۆژانێکی ساردی زستانێکی تووش و سەختدا مردووە، خەڵکێکی زۆر لەگەڵ تەرمەکەی لە هەڵەبجەوە هاتوونەتەوە بۆ سلێمانیو، لەوێش خەڵکێکی زۆرتر لەگەڵیا چوون بۆ گۆڕستان و لەنزیك گومەزی بابانەکانەوە، لە سەیوان، بەخاکی پاکی کوردستانیان سپاردووە.

پاش مردنی بە چەند ڕۆژێك لەلایەن حکوومەتی کۆنەپەرستی ئەو ڕۆژەوە فەرمانی لەئیش دەرکردن و گرتنی دەرچووە!

لە ساڵی١٩٥٨دا ئاهەنگێکی گەورە بەبۆنەی یادی دەهەمی کۆچکردنیەوە لە سلێمانی سازکرا.





# بێکەس

## ١٩٤٨-١٩٠٥

عەلادین سوجادی

لەبارەگای ئاوەدانی شاعرانا گەوهەری شەوچرا، لە سەراپەردەی خانەدانی ئەدیبانا جەوهەری بەرچرا، فیکری وەك تیشکی زەردەی خۆراوا، کە ئەڕژێتە سەر شەپۆلی ئاوا!.

بریسکەی ئەو ئاوە لەو زەردە پەڕە، وێنەی فیکری ئەم هومای شاپەڕە. جارێ بەیادی بەرزی نیشتمان، دەنگ ئەداتەوە دەنگی لە ئاسمان. کاتێ سەرزەنشت کۆنەپەرستی، نوکی قەڵەمی ئەخاتە هەستی. ئاڵای سەربەستی بیری نەمامی، ئاوی ئازادی سەرچاوەی فامی. ئاوی ژیان و مایەی دڵبەندی، کاژە بەفرەکەی چیای مەڵبەندی. جارجارێ باسی مەیت بو ئەکا، خوبو گوێگری پێ سەر خوش ئەکا. ڕەورەوەی تاریخ بێکەس ئەنوێنێ، ناوی لە ریزی ناوان ئەمینێ...

بێکەسی شاعر ناوی"فایەق" و کوڕی عبداللەبەگی کوڕی کاکە حەمەیە. لەساڵی "1905"ی میلادی لە ئاوایی"سیتەك" هاتوتە دنیاوە.

"سیتەك" دێیەکە بە"20" کیلۆمەترێك کەوتۆتە شیمالی ڕۆژهەڵاتی شاری سولەیمانیەوە، ئەو سەردەمە مەرکەزی قەزای شارباژێربوو عبداللە بەگی باوکی فایەق لەوێ تابوراغاسی بووە. لە پاش دوو ساڵ هاتونەتە سولەیمانی، لە تەمەنی سێ ساڵانا ئاوڵە دەرئەکاو"سێ" بەشی چاوی بە ئاوڵە ئەڕوا. هەر لەم وەختەوە قاپی مەینەتی بو ئەکریتەوە. لەساڵی "1911"دا باوکی نێراوە بۆ خانەقی و لەوێوە بۆ بەغدا، ئەنێرێ بە شوێن ماڵ و مناڵەکەیا ئەیانباتە ئەوێ، لە پاش ساڵێك باوکی چوە بۆ تورکیا و ئەمان لە بەغدا ئەمیننەوە، ئیتر هەر ئەو چاوپێکەوتنە بوو یەکتریان نەدیەوە، هەر لەو ماوەیەدا فایەق برایەکی لە خۆی گەورەتری هەبووە"حەمە سەعید"ی ناوبووە لە رووباری"دجلە"دا ئەخنکێ، دایکیشی لە تاوانا سوێی ئەبێتەوەو ئەمرێ، خاڵێکی لە بەغدادا بۆ مابووەوە لە پاش سێ چوار مانگ ئەویش ئەمرێ. فایەق خۆیو برابچکۆلەکەی- تایەر- بە هەتیوی ودەربەدەری ئەمێننەوە!...

سەرەتای شەڕی914-918دائەمەزرێ و ئەبێ بە ڕێبەندان، حاجی ئەمینی کاکە حەمەی مامی سفارشت ئەکاتە سەر حاجی عەلی ئاغا- کە لە بەغدا بووە- چاودێری فایەق و براکەی بکات و ئەو میراتەی لە باوك و دایکیانەوە بۆیان ماوەتەوە تیایانا خەرج بکا. حاجی عەلی ئاغاش ئەیانداتە دەست "حەبە خان" ناوێك کەژنە

زابتیکی سولەیمانی بوو و لە بەغدا دانیشتبو حەبەخان شێرانە چاودێریان ئەکاو توکە توکەیەکیشیان پێ ئەخوینێ، دووسێ ساڵێك بەم جۆرە ڕایئەبوێرن، لەساڵی "1917"دا کەساسی و هەژاریەکی زۆر ئەچێژن، لەساڵی "1918"دا ژنە ئەیانباتەوە بۆ سولەیمانی بۆلای حاجی ئەمینی مامیان، فایەق پشویەکی پیاهاتەوەو خرایە مەکتەب و لە پۆلی سێهەم وەرگیرا تا ساڵی "1923"هەر لە مەکتەبا مایەوە و هەموو ساڵێ بە یەکەم و دووەم دەردەچو، هەر ئەو ساڵە لەسەر ئارەزووی مامی چوو بۆ مەکتەبی عیلمیەی کەرکوك، بۆی ڕێنەکەوت لەوێوە بێ لەوێوە چوبۆ بەغدا لە ساڵی 1924-1925 چووە مەکتەبی"دار العلوم"، لەبەر دەمبزێوی لە ساڵێ زیاتر مەکتەب نەیگرتە خۆی، لەساڵی 1926- 1927 گەڕایەوە بۆ سولەیمانی تەنها پۆلی یەکەمی متوستە هەبو لە سولەیمانی چووە ئەو پۆلەو مامی چاودێری ئەکرد.

لە پاشا مامی لەبەر ئەوەی فایەق فێری عەرەق خواردنەوە بو دەریکرد! چوولای مامە عارفی لە حەفتەیەك زیاتر ئەویش نەیگرتە خۆی، بەناچاری بۆ نوستن گواستیەوە ئەو قوتابخانەیە کەلێی ئەخویند خەڵکیش یارمەتیان ئەدا بۆ خواردنەکەی، ئەم حاڵەی پێخۆش نەبو لە ئاخری ساڵی "1927"دا هات شتومەك و جل و بەرگەکەی خۆی فرۆشت و دوکانێکی جگەرەچێتی بۆ نان پەیدا کردن لە سولەیمانی دانا، دوای سێ چوار مانگ ئەمەش سەری نەگرت، دزداشەیەکی لەبەر کردوو فیستێکی سوری لە سەرناو سنوقێکی کرد بە بەرۆکیا جگەرەو شقارتەی تێخست و بەناوشارا دەستی کرد بە فرۆشتنی، ئەمەش زۆری نەخایاند پەنای بردە بەر دایەرەی ئەشغال، بە ڕۆژانە لە ڕێگای عەربەت ئیشیان دایە. بەم جۆرەش سێ چوارمانگێکی رابوارد، لەساڵی "1928"دا بو بە مامۆستای "زانستی"، لە ساڵی "1929"دا ئەبیستێ کە باوکی لە"مەرعش" مردووە، لە ساڵی "1930"دا بەهەر کولەمەرگیەك ئەبێ ئەچێ بۆ بەغداو لەوێوە بۆ حەلەب و بۆ تورکیا، بەونیازە شتێکی لە میراتیەکەی باوکی دەست کەوێ- میراتیش کەوتبوە گەروی خەڵك. شتێکی وای دەست نەکەوت- لە ئاغستوی عەینی ساڵدا گەڕاوەتەوە بۆ سولەیمانی لە ڕۆژی شەشی ئەیلولی ساڵی "1930"دا هەرای بەردەرکی سەرا لە سولەیمانی ئەقەومێ، هەرای داواکردنی سەربەخۆیی کورد، فایەق گیراو بەدیل برا، کەبەرەڵاکرا بۆئەوەی نان پەیداکاو بیخوا، هات لە سولەیمانی قوتابخانەیەکی داناو دەستی کرد بە دەرز وتنەوە، ئینجا لەساڵی "1933"دا وەزارەتی مەعارف وەری گرت و بو بەمامۆستای مەکتەب، سەرەتا لە دێی "مورتکە" لە ناوچەی بازیان، تا ساڵی "1937"هەر لە لیوای سولەیمانی بووە لەم تاریخەدا نیرا بۆ"حلە"، لەساڵی "1938"دا پێیانوت بچێ بۆ"عەمارە" نەچو و، وەزیفەکەی دایە دواوە گەڕایەوە بۆ سولەیمانی دەستی کردەوە بە دانانی قوتابخانە تاساڵی "1941"، لەم کاتەدا سەر لە نوێ گەڕاندیانەوە بۆ مەعارف هەر لە لوای سولەیمانی، سەرەتا بۆ قەرەداغ، بۆ ناو شاری سولەیمانی، بۆ سورداش و بۆ هەڵەبجە، تالە ڕۆژی"1948/12/18" لە تەمەنی"43" ساڵیدا لە هەڵەبجە ئەم ژیانە پڕ جەورو ستەمەی بەجێ هێشت و تەرمەکەی هێنرایەوە بۆ سولەیمانی و لەگردی سەیوان وەکو گەلێکی تر لە نازداران نیژرا[1].

کە سەیری لاپەڕەی ئەم ژیانەی فایەق ئەکەیت هەر لەو ڕۆژەوە کە لە کۆشی دایکیا مەمکەی ئەمژی و چاوشارکێی لەگەڵ ئەستێرەکان ئەکردو بە پەنجەکانیشی ڕاوێژی لەگەڵ ئەو فیلیمانەدا ئەکرد کە مەینەت و ئاوارەیی پاشەڕۆژیان پیشان ئەدا، تا چووە گۆڕەکەو سەری ئەبەدی نایەوە لە جەزرەبە بەولاوە شتێکی تری لە ژیان چاوپێ نەکەوت. وەکو بڵێیت هەر لە بێشکەی دارەوە زانیبوی کە بێشکەی دنیا بە دەسرازەی خەم و مەینەت و پەژارەیی ئەبێ کۆرپەی تێدا شەتەك بدرێ!...

فایەق پیاوێکی میانە باڵای تێك سمڕاو بووە، سەری زلو دەم و چاوی گرد، چاوێکی کوێرو ئەویتریشیان نیوەی هەبو، لوتی پان و دەمی بچوك بو، ریشی ئەتاشی و توزێ لە سمێڵەکەی ئەهێشتەوە، چاکەت و پانتۆڵی لەبەر ئەکرد، زۆریش بە تەنگ جل و بەرگەوە نەبو، لەقسەکردندا لە سەرخۆبو وەکو بڵێیت بەدانەدانە قسەی ئەکرد، زۆر ئاشنابووە بە خواردنەوەو ژیانی سەرخۆشی، یاریشی ئەکرد، لەدوا دوایی ژیانیا هەناسەبرکێی پێکەوتبو بە نیخەنیخ قسەی دەکرد، باری ژیانی چەوسانەوە بووە، لە ئیدارەی ناوماڵدا زۆر کوك نەبووە، سەرەڕای ئەمەش بەرچاوتێربووە، ئاشنای گۆشەی مەیخانەکان بووە، باوەڕێکی ڕاست و لە ژیانا یەك ڕێگەی کردبو بە پیشەی ژیانی خۆی، ئەگەر لە دڵا یەکێکی نەویستایە هەر ئەو نەویستنەبوو ئیتر نەیئەدوان. زیرەك و بەزەیین بووە، کە بشهاتایە بەسەریا شەرمی لە کەس نە ئەکرد، لەگەڵ ئەمەشدا زۆر زمان پاك بووە لە شیعردا، قەڵەندەربو بۆیە بو بەرەند!.

فایەق کە چاوی پشکوت یا، دەمی لە مژینی پەنجەی خۆی بەرەڵا کرد، تەماشای کرد منالان لە دەمە دەمی ئێوارانداکە باوکەکانیان دێنەوە ئەچنە پێشوازیان بۆ ئەوەی پێکەوە بچنە ژورەوە تا شەو، کەدائەنیشن ئەم لایان باوکیان بێو ئەو لایان دایکیان، کەچی ئەم بە تەنیا لە باتی دەستی باوك دەستی برابچکۆلەکەی ئەگرێ و ئەچێتە ژورەوە، دایکیش نەماوە تابێت بەپیریانەوە!.

ئەم دیمەنە دڵی منداڵێك بریندار ئەکا بەڵام ڕەنگە زۆر دڵی فایەقی بریندار نەکردبێ، چونکە جێگەکەی لە تەنیشت جێگەی ئاسۆی هیواوە بو، بەشەو لاپەڕەی بەیازی شاعیرەکانی ئەخوێندەوە هەر بۆ ئەمەش بو کە تەنیایی پێخۆش بو، کارەساتی ڕۆژگاری لە سینەمای خەیاڵیا دەور ئەکردەوە، کە شەڕی1914-1918 چەبۆ خۆی، چ بۆ قەومەکەی یەك لە سەریەك ئەیخستە شریتەوە، ژیانی لەبەریەك هەڵپچڕاوی خۆیو ناوشاری سولەیمانی تەماشا ئەکرد، کە

جەوری زەمان بەسەریانا ئەهێنیٚ و هێناویە، ئەوەی ورد ئەکردەوە کە بۆچی شیرازەی ئیشوکاریان لەبەریەك هەڵوەشاوە؟.

کوتوپڕ لە ترسی ئەم دیمەنە بە سامانە ڕاچەنی و ئاوڕێکی دایەوە بەلای خۆیەوە وبەخۆی وت: "تۆچیت؟ من کوردم نەتەوەی کوردم"، خۆ کوردیش بێکەسە ئەگەر کەسێکی ببوایە حاڵی ئەو حاڵە نەئەبو! وتی کەوابو من بێکەسم! "بێکەس"ی لە دەربەدەری کوردەوە کرد بە ناوی خۆیو لە بادەی بێکەسانی هەردە گەڕانا شەرابی شیعری خواردەوە.

ڕاستە لە دەوری بێکەسدا شیعر پەردەیەکی تری بەسەردا هاتبوو لە خێوەتی غەرامەوە سەری هێنابوە مێرگی قەومیەت، بەڵام ناتوانین بڵێین تەنیا ئەم سەرەتاتکێیەبو کەبێکەسی خستە ئەو مێرگەوە، یا بێکەسی فێری شیعر کرد، چونکە زۆرکەس لەهاو چەرخی بێکەس هەر لەژێر خێوەتەکەدا مانەوە بۆ ئەوەی باوەش بکەن بە غەراماو چاو ببڕنە چاوی کاڵی غەرام! یا ناتوانین بڵێین سەدەی بیستەم بو کە بێکەسی فێری شیعر کرد، چونکە بێکەس ئەگەر لەم دەورەشا نەبوایە هەر شاعیر بو، بۆیەش شاعیر بو چونکە لە باوەڕی ئەودا سەربەستی وشیعر دوو ناو بون بۆیەك مەعنا. دەی ئەمە ناتوانریٚ بوترێ لە یەکێکەوە وەریگرتوە، یاشتێك کاری تێکردووە بۆ ئەوە وابێت.

بەڵێ پەرێشانی خۆیو کۆیلەیی قەومەکەی بێکەسی هەڵخزاندوە بۆ ئەوە کە ڕوحیەتێکی ئاژاوەی ببێ، چونکە ڕوحی ئاژاوە لەو سەردەمەدا گەڵێ شوێنی کوردەواری گرتبووەوە، بەڵام وەنەبیٚ تەنیا ئەمەش بوبێتە سەرچاوەی ئیلهامی شیعرەکەی، ئەگەر ئەمە بوایە لەبەرئەوە کە ئەمە شتێکی تیکڕابێ بۆ ئەبوایە خەڵکی تریش ئەو عاملەکاری تێکردنایە کەچی تەنیا بێکەس بو کە ئاگرێکی ڕاستەقینە لە دڵیەوە بڵیسەی ئەسەند..

بەڵێ ڕاستە لە پێش بێکەسدا و لە دەوری ئەودا پۆلیس و ئەدەبی غەرامی دەستیان کردبو بەیەکدا بۆ سەر بڕینی ڕۆحی پیشکەوتن و ڕوحی گۆڕان لە دەورێکی وشکەوە بۆ دەورێکی تەڕ، وەیاخود بڵێین لە دەورێکی"ڕومانتیکی"یەوە بۆ دەورێکی"کلاسیکی"! بەڵام وەنەبیٚ دیسان ئەمەش ئەوەمان پێشاندا کە ئەم کارەساتە تەنیا شتێك بوبێت و ڕاوی بێکەسی نابیٚ بۆ ئەوە لە تاوانا خۆی باوێژێتە کۆشی شیعرەوەو خۆیو قەومەکەی پێبلاوێنێتەوە! ئەگەر تەنیا ئەمە بوایە ئەبوایە بێکەس دوو بونایە، کەچی هەر یەکبو!.. دیسان ئەمەش هەر وایە کە بێکەس پەلاماری پیاوەکانی مزگەوت و ئایینی ئەدا و لە سەدەی چواردەهەمی هیجریدا ئەهات هەلیئەسەنگاندن و بە ئەقڵی سەدەی بیستەم بەرەنگاریی ئەکردن و بە ئاوێکی ڕوون ئەیشتنەوە بۆ ئەوە کارەبای بە قوڕ داپۆشراوی ئایینی ئیسلام سەر لە نویٚ ڕووناکی بداتەوە!.

ئەمەی کە ئەکرد وە نەبیٚ لەبەر ئەوە بوبیٚ کە سەرچاوەی شیعری لە سەرچاوەی ئایینەوە هەڵێنجابێت، وەیا زانیبێتی، "ڕوپرت بیرنز1759-1796" شاعیری ئەسکتلندە پەلاماری کڵیسەکانی ئینگلتەرەی داو ە!.

ئەگەر وابوایە گەڵێ کەسی تر لە سەرچاوەکە ئاویان هەڵێنجاوە و گەڵێ کەسی تر لەوانەبوون"بیرنز"یان ناسیبیٚ کەچی بێکەس بە بێکەسی، گوڕی خۆی ئەبەست و پەلاماری ئەو باوەڕەی ئەدا، بەبیٚ ئەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ ڕەچەڵەکی مزگەوتەکەدا دابڕێت!.

کەوابو وەنەبیٚ تەنیا یەکەیەکەی ئەم شتانە بوبێت کە بێکەسیان خستبێتە کۆشی شیعرەوە، بەڵکو هەمویان بە تیکڕاو شکوهێکی مەعنەوی فیتری بە تایبەتی بووە، بۆ ئەوە بە هەردوویانەوە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە پاڵ بنێن بەجەمالی تەبیعەتەوە تاچرۆی نەرم و نیانی بێکەس لە بەهارستانی میللەتا ببیٚ بە گولوکێکی دەمە دەمی بەیان وببیٚ بەخونچەی باخچەی نیگارستان و بەیادی فیکری قەومیەتەوە کوتوپڕ دەم بکاتەوە.. یاخود بڵێین بۆ ئەوەبووە کە بەهەر دووکیانەوە بەدرێژایی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم شریتێکی تر لە عالەمی کوردیدا بخەنە کار و بێکەس لەو شریتەدا ببیٚ بە گویایەکی دەنگ زەلالی دڵڕفێنی میللەت، وەیاببیٚ بە بولبولێکی خۆش نەوای لالەزاری قەومیەت!..

مایەوە سەر ئەوە بزانین شیعری بێکەس چ پایەیەکی لە ئەدەبیاتی کوردیدا وەرگرتووە وە مێژووی ئەدەبی کوردی چ ئاشنایەتیەکی لەگەڵ شیعری بێکەسدا هەیە؟.

بەڵێ وەکو توزێکی لێوترا "بێکەس" گەلێجار لە ژیانی پێشویدا حەزی بە تەنهایی و گۆشە گیری ئەکرد، لەم ڕابواردنەیدا بۆ خوێندنەوەی دیوانی شاعیرەکان، ئەو شاعیرانە کەزۆرتر سەرچاوەی ئیلهامی شیعریان غەرام و تەسەوف بووە. لێرەدا ناچار ئەبو، یەعنی شعور ناچاری ئەکرد بەوە کەسەربەرێتە دیوانی شاعیرەکانی فارسیشەوە، لەبەر عەرەبی خوێندن دیسان حەزی بە خوێندنەوەی شیعری عەرەبیش ئەکرد. ئەم سەودایە بێجگە لە فترەتی زاتی —پاڵی پێوە نابو شیعر وتن وەکو ئەوان، وە وەکو لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا بۆمان دەر ئەکەویٚ دیوانی شاعیرەکان تا ئەو سەردەمە مەگەر بەدەگمەن ئەگینا هەر غەرام و غەزەل و تەسوف بووە، ئەمیش بەو جۆرەهات لە پێشا لە سەر ڕێچکەی ئەوان بە خەیاڵی، خۆی، خۆی ئالان بە غەرامەوە و کەوتە داوی دڵخوازیەوە ولەو مەیدانەدا ئەسپی خۆی تاودا.

نموونەیەك لەو ڕێگەیە کە گرتبوی ئەم پارچە شیعرەی بوو:

**دڵیٚ لە خۆیا دایم تەڕ نەبیٚ — سەرخۆشی بادەی رووی دڵبەر نەبیٚ**
**مەفتونی باڵای قەد عەررعەرر نەبیٚ — بە جامیٚ شەراب کەیل ومەست نەبیٚ**
**سا، خوا ئەو دڵە دایم پەستی کەی!**
**دڵیٚ هێلانەی عشقی‌یار نەبیٚ — بەتیری نازی بریندار نەبیٚ**
**کوشتەی ئەو دیدەی پڕخومار نەبیٚ — بەجامیٚ شەراب نەشەبار نەبیٚ**
**سا، خوا ئەودڵە دایم پەستی کەی!**

تەماشا ئەکەی لەم شیعرانەدا بێکەس بە شێوەیەکی غەرامی

ڕازو نیازێکی لەگەڵ دڵکردووە وفەلسەفەیەکی حەقیقەتی دڵی دەربڕیوە، بەڵام ئەگەر بێینەسەر ئەوەی کە بزانین ئەم شیعرانە لە باری غەرامدا چ نرخێکیان هەیە؟ لەم سوچەوە ناتوانین پایەیەکی بەرز بۆ ئەم شیعرانە دابنێین، چونکە ئەگەر مەبەست لەغەرام ئاهو ناڵەی جەرگی هەڵکڕوزاوبێ بەرانبەر بەدۆستێکی دڵچەپاوکەر، یا پاڕانەوەی کوژراوێکی دەست عەشق بێت لەبەردەست پادشای جەمالی دڵخوازی تاڵانکەری هۆش و شعوردا، وەیا باسی دیمەنی جوانی عەلعەناتی نازو عیشوەی چاو و برۆ و خەت و خاڵی دڵبەر بێ کە ئەمانە ڕێکەی شاعیرە غەرامیەکانن، ئەم باسەی بێکەس لەم ڕووەوە هیچیان نیە، بەڵکو تەنها باسی ئەوەت بۆ ئەکا کە، دڵ:

ئەو دڵە کە هێلانەی مەعریفەتی ناسوتیٚ ولاهوتیە ئاوێنەیە بۆ نیگاری تەبیعەت و کەون، کونە شاری بازی خەیاڵی خۆش پەروازەو ئارامگای حەسانەوەی هەموو ڕازو نیازێکە، ئەگەر لە خۆیا سۆزو گودازێکی نەبێ‌و خۆی وەکو بلوری بێگەرد ساف و بێگەرد نەبێ و، نەبێ بە ئاوێکی ساف لە شەوی مانگێکی چواردەدا و وێنەی مانگەکەی تێدا دیار نەبێ‌و بە نەسیمێکی فێنکی وەکو بادەیەکی شەراب نەبزوێتەوە، بۆ ئەوە بەهۆی زنجیرەی وردە شەپۆلەکەیەوە دیمەنی مانگەکە بکا بە هەزارمانگ کە ئەمە هەم مەعریفەت و هەم محبەت و هەم جەمال پێشان ئەدا، دڵێ کە لە خۆیا وانەبێ با هەر نەبێ، چونکە وەختێ خۆش و جوانە کە بە تەبیعەتی خۆی پێك بێت، ئەوەك بە زۆرەملێ و بەتێوەژەندن. لە کوێ ئەو سێوە، کەخۆی بە تەبیعەتی خۆی لە دارەکەوە پێبگاو سوور هەڵگەڕێ؟ لەکوێ ئەوەی کە لێبکرێتەوە و بەزۆری پەنجەو نینوك بگەیەنرێت و سووربکرێت؟!.

وتمان ئەم شعرانە لە باری غەرامدا نرخێکی وایان نیە وە مەعنای غەرامیشمان والێکدایەوە کە شاعیرەکانی تر لە سەری ڕۆیشتون. ئەمەمان وت بەڵام بێینەسەر ڕاستیەکەی و حەقیقەتی باسەکەی... بێکەس خۆی هەستی بەوە کردبو کەلەسەرو ڕواڵەتداو لە باری جوانیدا مەگەر وێنەکەی خۆی بوایە لە ئاوێنەدا، ئەگینا کەسی تر لەو نەئەچوا!. نەبێ بە چ ڕوویەکەوە بکەوێتە شۆخی بازی وپەنجە بازی لەگەڵ ئەو دڵبەرانەدا کەسای گەردنیان لە سای سەمەنا، وەك تریفەی مانگە لەبەر بەنەنا!. کەوابو ئەبێ بە جۆرێ بێتە مەیدانەوە کەدڵی نازداران لە گۆشەی ڕەشماڵانا بە چەشنێ بکا بە پەروانەی دەوری چرای خۆی کە هەموو کەس لە گۆشەی ئاسایشەوە سەیری ئەم فەساڵی بێکەس و جەماڵی ئەو فریشتانە بکا، ئەمەش مەگەر بەو جۆرەبێت کە، ڕچەیەکی تازە بشکێنێ بۆ غەرام، ئەگینا ئەگەر وەکو هی پێشینەکانی بێ ئەوەك هەر نازداران بەڵکو کەس ئاوڕی لێناداتەوە. جابەم بونەوە بێکەس هات ئەم جۆرە غەرامەی خستەناوەوە.

هات دڵی کرد بە هەیکەلی بادەو پەیکەری عەشق و سەرچاوەی جوانی‌و شەرابی ئەرغەوانی، و ئەو هەتا یاری نازدار بەچاوی پڕخومار و بە باڵای وەك شمشاڵ و بە نازی بێئەندازەوە سەیری بکا!.. ئەگەر تەماشای ئەم سوچە بکەین بێکەس شاعیرێکی غەرامیە، ئەوەك هەر ئەوەندە بەڵکو تیایا کولاوە و شیعرەکانی شانشینێکی هەرە بەرز بۆ خۆیان تەرخان ئەکەن.

بێکەس پەردەی غەرام دائەداتەوەو ئەکەوێتە عالەمی سەرخۆشیەوە، ئەکەوێتە ئەو عالەمەوە کە لە سەرەتاوە عەوداڵی بوو، هەر ئەو عەوداڵیەبو توشی غەرامی کردبو ئەگینا ئەوچی و غەرامی کولەنجە ڕێڕێی‌چی؟! ئەکەوێتە عالەمی مەی گێڕەوە، بەڵێ عالەمی مەستی، عالەمێکی هەستی، بۆ بێکەس، هەر لەمەیەوە بۆ پەیدابو، وەتا مردیش هەر تیابو!.

سەودای مەی و مەیخانە ومەی گێڕی خولامانە داری تازە خەتی سەوز ڕواو لە سەر لێوی ئاڵی، بێکەسی خستە هەموو کوردێکەوە بادە پەرستی و مادە پەرستی بێکەس شەرابی ئەرغەوانی و کوڕی نەخچەوانی هێنایە سولەیمانیەوە، نەناوی شەراب مایەوە بۆ خەرقە پۆشان، نەناوی غیلمان بۆ بەهەشت فرۆشان!. بەبێ پەردە ڕوو ئەکاتە مەی گێڕی سادەو پێی ئەڵێ:

دڵ بەستە! هەستە ساقی فیدائم    حەیرانی لەنجەو بەژن و باڵاتم
شەرابێ با، بێ، بۆ دڵەی ماتم    ڕەونەقی، شەوقی، بابەحەیاتم
لە دەستی پەستی بدا نەجاتم!

شەرابێ وابێ عومری نوحی بێ    سەفابەخشی دڵ، نەشئە ڕوحی‌بێ
گون و صفا، لابەری جەفا    بەزم و ڕابتەی یارانی وەفا
شەرابیکی وا بە تەنها جامێ    تە کامل بکا خامی ونەفامی
قەدەح پەیاپەی پڕکە لێواو لێو    بێنەو مەترسە لە تەعنەو جنێو
دەخیل مەوەستە ساقی فرسەتە    وەختی خواردنەوەو کەیف وعوشرەتە
موغەنی ساتۆش ڕۆژی همەتە

دڵ زۆر مبتەلای دەنگ و نەغمەتە    تو خوا قەتاری، دڵ بوت لەت لەتە!
بە ناڵەی نەی و نەغمەی ئەرغەنون    بە نەشئەی مەی و شەرابی گولگون
با، لە دڵ دەرکەین سزای گەردون    ئاسودە ساتێ دڵ ببێ مەمنون
ساقی ئۆباڵی منت بە ئەستۆ    دنیایە وەسیەت ئەکەم لە لای تۆ
کە مردم تو خوا هەر بەمەی بمشۆ    بۆم مەکەن شین و گریان و ڕۆ ڕۆ
لە جێی یاسین و تەڵقین و شینم    بێن کۆڕێ بگرن لە ژور سەرینم
بە بەزم ورەزم و بە ئاوازی خۆش    ئێسك و پروسکم هەموی ببی گەش

بەڵێ ئەم شیعرانە گەڵێ وێنەیان هەیە، نە، بادە پەرستی شتێکی تازەیە، نەمادەپەرستی! مێژووی ئەدەبی کوردی وەکو ناتوانێ بڵێ ئەمانە شتێکی تازە بابەتن وە یافیکرێکی وردن و بێکەس دایانی ناوە و بۆیان چووە، ناتوانێ ئەوەش بڵێت کە بێکەس وەکو شاعیرە تسوفیەکان نیازی لە شەراب شەرابی خەرقە پۆشان بووە، چونکە هەر خۆی لە شوێنکی تردا ئەڵێ:

داخی قەرزاری عەرەق خستومیە فاك وفیکەوە
گا بەدەست(جەرجیس) و(عەبد) و، گا بەدەست(ئوفیك)ەوە[2]
هەر کە ڕۆژئاوابو ئیتر بۆ عەرەق سمکۆڵ ئەکەم

**وەك وڵاخێ بێته وەختی كاو جۆی ئالیكەوە!**

ئەوەندە هەیە ئیمە ئەوەمان بۆ دەرئەكەوێ كە بێكەس لە هەر ڕێگەیەكدا كە گرتبێتی سەربەست و بێ پەروابووە، ڕاستەو ڕاست هاتۆتە مەیدانەوە وە لەباری ژیانی دنیاییدا تا ئاخر پلە دڵ بریندارو پڕ ئازاربووە، ویستویە بەسەرخۆشی مەی خۆی لە خەمی دنیا دورخاتەوە، وەكو هەر لە ئاخری ئەم شیعرانەیدا ئەڵێ:

**حەقمە گەر عارەق بخۆم، تو خوا ڕەفیق لۆمەم مەكەن**
**زەحمەتە بێ مەی ژیانم بەم دڵەی تاریكەوە!**

ئەو شۆڕشی سەرخۆشی و بادە پەرستیە كە لەمێشكی بێكەسدا بووە هەر ئەو شۆڕشە بووە چووەتە مێشكی"ئەبونواس"ی ئەهوازیەوە لە ساڵانی"729-885"ی میلادیدا، كەچی ئەبونواس ناسراو، بێكەس قاودرا!.

بێكەس پەردەی شیعری سەرخۆشیش دائەداتەوە و ئەچێتە ئاسمانێكی ترەوە، ئەچێتە ئەو ئاسمانەوە بۆ ئەوەی نیشتمان و قەومەكەی بەرچاوكەوێ. لەم شوێنەدا بێكەس بازێكی تیژباڵ و ڕەندێكی هەردە گەڕە، بۆ ئەوە دروست كراوە كە نەوای قەومیەت وەكو دەنگی زەنگی بەری بەیان بلاوكاتەوە و لە سۆزی دەرونێكی بە جۆشەوە بڵێت:

**ئەی وەتەن مەفتونی تۆم و شێوەتم بیركەوتەوە**
**وەختی بەندی و ئەسارەت پێ بە بەندو كۆتەوە**
**من لە زكر و فیكری تو غافڵ نەبوم، واتێ نەكەی**
**حەپس و تێهەڵدان و زللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە**
**بەو خوایەی بێ شەریك و لامەكان و واحدە**
**عەشقی تۆ جورێ لە دڵما ئاگری كردۆتەوە**
**ئاگرێكیوا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر**
**قەت گرو كڵپەو بڵێسەی تا ئەبەد نەكوژێتەوە**
**باسی مەحزونیو كەساسی خۆت نەكەی توخوا وەتەن**
**چونكە بەو باسە برین و زامەكەم ئەكولێتەوە**
**ماتەمینی تا بەكەی؟ دەی پێ كەنەو سەر هەڵبڕە**
**مفتەخر بە، شهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە**
**نەگبەتی لاچو، سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ**
**كەوكەبی بەخت و فریشتەت بەرزە ئەدرەوشێتەوە**
**گەرچی بەینیكە زەلیل و دیلی دەستی زاڵمی**
**نوبەتی شادیتە، ئەمجا ناحەزت لێك بێتەوە**
**لافی میللیەت بە دەم لەم عەسرەدا كەڵكی نیە**
**ڕوژی هەوڵە، هەر بەهممەت گۆی هونەر ئەبڕێتەوە**
**بی قسورە، چەند جەسورە، سەدشوكر ئەولادەكەت**
**والە ڕێی تۆدا، لە خۆێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە؟!**
**بەسیە تەعنەم لێ مەدە هەر ڕوڵەكەی جارانتم**
**هێندە حلمت بێ هەتاكو دەست و پێم ئەكرێتەوە**
**شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەرخودا دەستم بدا**
**دوشمنت پەت كەم وەكو سەگ، بیخەمە ژێرپێتەوە!**

ئەم شیعرانە دەورێكی كوێلەیی بێكەس و نیشتمانەكەیمان پیشان ئەدەن، ئەوەمان پیشان ئەدەن كە ئەو نیشتمانەی ئەوی تێدا گۆش كراوە لەژێر باری چەوسانەوەدا تلاوەتەوەو بێكەس بەدەنگی زوڵاڵی شیعری هەمووجار بانگی بۆ هەڵداوەو لە پاشا بۆی كەوتۆتە گۆشەی بەندیخانەوە، لەوێش دیسان لە سۆزی ناڵەی خۆی هەر نەكەوتوەو باوەڕی قایمتربووە بەوە كە ئەو ئەبێ شاعیریكی قەومی و نیشتمانیبێ.

هەمو پەردەی ژیانی بێكەس پەردەیەكی تاریك و ژیانێكی تاڵ بووە، دەمێ بێ نەوایی، دەمێ ئاوارەیی. كاسە، كە پڕبو ئەبێ بڕژێ، لێرەدا بە پێچەوانەی ئەو ناهەمواریانە كە سەریان لێ دابو دەم ئەكاتەوە و ئەڵێ:

**دڵ! كە زۆر مەسرورە ئیمڕۆ، ئارەزووی سەیران ئەكا**
**حەز لە فنجانی شەراب و دەست و پەنجەی یار ئەكا**
**دڵ! گەشە وەك گوڵ وەهایە دەردو ئازاری نەما**
**تالبی ویسكی و شەرابە، حەز لە عود و تار ئەكا**
**دڵ! نەجاتی بو لە تەنگی، كەوتە بەزم و ڕەزمەوە**
**عاشقی سەیرو سەفایە، مەیلی ناو گوڵزار ئەكا**
**دڵ! ئەوەندە مەست و كەیلە شێتە هیچ هۆشی نیە**
**والە ڕەقسایە خەریكە عالەمێ بێزار ئەكا!**

بەڕاستی بەلاغەت و دڵتەڕی لەم شیعرانەدا گەیاندۆتە شوێنی خۆی، هەر چەندە ئەمانەی بۆ دەست نادا، بەڵام ئەو گوێی نەداوەتێ، داوای ئەوە ئەكا كە دڵی خۆشەو فنجانی مەی و دەست و پەنجەی یاری ئەوێ، وات پیشان ئەدا كە گوایا دڵ تەنگی بەسەرچو، داوای سەیرو سەفا ئەكا!.. لە بارێكی تردا ئەبێ بڕوای پێبكرێ كە دڵ خۆشە، چونكە گیانی ئەو لەگەڵ گیانی میللەتدا تێكلاو بوبو، ئەبینێ وا نەشئەی میللیەت لە ناودایە، وەكو هەر لەو بڕە شیعرەدا باسی ئەكاو ئەڵێ:

**دڵ بە نەشئەو بەزمی میللیەت شوكر بوژایەوە،**
**شایە، سەیرانە، بەزمە پڕ بە دەم هاوار ئەكا**
**دڵ بە ئاواتی گەیشت و لاوی كوردی دی كەوا**
**یەك دڵ و یەك دەم خەریكە میللەتی هوشیار ئەكا**
**دڵ لەكینە خاڵیە، بێ گەردە سافە وەك بلور**
**سەد تف و لەعنەت لە چارەی خائنی سەگسار ئەكا!**
**دڵ ئەڵێ بێكەس هەتا كەی لافی میللیەت بە دەم**
**هەوڵ و تێكۆشینە تەنها قەومی تۆ ڕزگار ئەكا**
**گەر بەڕاستی بێنە پێش و دەس لە دەس یەك كەن هەمو**
**كێیە ئەوسایە حقوقی قەومی كورد ئینكار ئەكا؟**
**یەكتریتان خۆش بوێ تا نەگبەتی بەرتان بدا**
**دو دڵی ئەم قەومە دیل و سوك وبەدڕەفتار ئەكا!**

لەبەر ئەمانە پەردەی تاریكی لەسەر دڵی لا ئەچێ و ڕووناكی لە

ئاسۆی هیواوە ڕووی تیئەکا، دیارە خەیاڵبازی ناکا، هەموو شت ئەخەلەتیٚ تەنها عاشق نەبیٚ، خەڵەتان بۆ ئەونیە تابە ئاوات نەگا. عاشق بە جەمالی یار و عاشق بە مەڵبەند و دیار هیچ جیاییەك لە بەینیانا نیە، چۆن، یەکەم تابەیار نەگا ناحەوێتەوە و هەر لە سۆزدایە دووهەمیش تا بەدیار نەگا هەر عەودالەو لە گودازدایە..

بێکەس عاشقی قەوم و ولاٌتەکەی بووە، عاشقی نەسیمی سەر بەستی بووە، وا بۆنی ئەو نەسیمە کە هەوای میللەتە بەسەر ڕۆڵەکانی ولاٌتا و یەك دڵی و یەك زمانییانە لە باوەڕی ئەودا ئەو بۆنە دێت، کە هات ئەوا دڵەکەی بە ئاوات گەیشت و شایی و سەیرانیەتی و بە هیچ شتێك هەلٌ نەخەڵەتا. لە مەوە، ئەوە بۆ ئێمە دەر ئەکەویٚ کە ناهەمواری ژیانی بێکەس و دلٌ تەنگیەکەی لەبەرکەم و کوڕی تەنها ژیانی خۆی نەبووە، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە کە:

ئەو پەروانەی چرای میللیەت بووە، کە میللەتەکەی حەسایەوە ئیتر ئەو خۆی بە حەساوە زانیوە باشێوی شەویشی نەبوبیٚ، بۆیەش وابووە چونکە دیار بوە کە شاعیرێکی قەومی بووە...

بێکەس بە دزە دزەیەکەوە، بە چواریەکە چاوێکەوە، یا بەڵکو بەچاوی ساغی گەشی دڵیەوە، سەیرێکی تێکڕای کۆمەلاٌیەتی ئەکا، لەبەر ئەوە لەگەلٌ سوچەوە تاریکی ئەبینیٚ، دەست ئەکا بە توانج گرتن، دەستەی مەلاو شێخی لە پێشا بەرچاو ئەکەویٚ ڕوویان تێئەکاو باسی خۆی ئەگۆڕیٚ. یەکیٚ لەو شتانەی شەش بەندەکەیەتی کە هەر بەندی شەش نیوە شیعرەو هەر بەندە لەسەر قافیەیەك ئەڕوا. ڕوو ئەکاتە مەلاو سەرەتای ئەکاتەوەو ئەڵیٚ:

**هەر دوگوێم پڕبو لە باسی وەعز و سەرفترە وزەکات**
**هەر هەواڵی حەشر و نەشرم پیٚ ئەڵیٚ تاکو مەمات**
**بەسیە لەم مەوزوعە لادە، فێری نوێژ بو کائنات**
**خوتبەیەکی ئیجتماعیم پیٚ بڵیٚ بۆ ڕێی حەیات**
**ئەی مەلا توبی خوا لەم فیکرە کونەت لابدە!**
**فەنی تازەم پیٚ نیشاندە بۆ تەرەقی‌وربیٚ نەجات**

بە پێنج چوار خشتەکی ڕوو ئەکاتە دەستەی شیخ و ئەڵیٚ:

**لای گەلیٚ وایە کە جەننەت تەکیەو و لانخانەیە**
**چی مریدو شیخ و سوفی و مەلجەئی دێوانەیە**
**غەیری ئەم قسمانە باقی کافری بوتخانەیە**
**موختەرع، عالم، منەوەر پەشمەلای ئەفسانەیە!**

کە لەمانە ئەبێتەوە سەیری مەردەمی تر ئەکاو کردەوەیان هەڵئەسەنگێنیٚ، کارەساتی ئەفەنی و پیاو ماقولی بەرچاو ئەکەویٚ بە"دە"پێنج خشتەکی ڕوویان تیٚ‌ئەکاو ئەڵیٚ:

**منەوەر زۆری هەر لەبەر نانی　　وەتەن ئەفرۆشیٚ بەیەك تارانی**
**ئەخاتە ژێرپیٚ دین و ئیمانی　　کاکە خوا ئیشی نابەجیٚ ناکا**
**تاکێو نەبینیٚ بەفری تی ناکا!**
**ئەشرافمان هەمو بیٚ ڕوح وستن　　دەخیلە پشتیان هیچ پیٚ مەبەستن**
**هەمو ناکوك و پارە پەرستن　　کاکە خوا ئیشی نابەجیٚ ناکا**

**تاکێو نەبینیٚ بەفری تیٚ ناکا!**

لەبن دەست ئەمانەوە لا ئەکاتەوە بۆ چۆنیەتی کاروباری شاری سولەیمانی وکردەوەی کار بەدەستەکانی، لە ڕیگەکەی ئەوان وریگەی خۆی سەرسام ئەمینیٚ، بە دەغەزاریەوە دەم ئەکاتەوە و ئەڵیٚ:

**توشی لافاوی عیلم بوم و بەلاٌم زوو دەربەڕیم**
**سواری واپوڕی جەهل بوم و بەناویا تێپەڕیم**
**سەد شوکر ئۆخەی نەجاتم بولە باسی عیلم و فەن**
**نامگرن جارێکی‌تر، ئەمجا لە کەیفا هەڵپەڕیم!**
**گەرچی تا ئێستا وتومە: تیٚ بگەن زوبیٚ بگەن**
**بەوقسانەم ئیوەقەت با وەڕمەکەن، سەگ بوم وەڕیم!**
**خویندەواری شێتیە، هەر جەهلە ئینسان سەر ئەخا**
**گەر لە مەولا ناوی عیلمم برد بزانن سەرسەریم**
**هێندە تەعقیبی حەقم کرد تاکو نانی خۆم بڕی**
**سوك و ریسوابوم لە ناوا، گیرۆدەی ئاخر شەڕیم**
**چاکە، زانیم حاڵی عاقل نەفیە، حەپسە، یا شەقە**
**هەر کتێبیکم هەبو دوێنیٚ لە داخانا دڕیم!**
**پیاوی دانا، عەقڵی دانازانی بۆی ناچێتە سەر**
**بەرگی نادانیم لەبەر کرد و لە حەپسی دەرپەڕیم**
**شەرتە"کەر"بم! بارە گوێزم لیٚ بنێن خڕەی نەیە**
**بادەمێکیش زۆر و کەم وەك بیٚ غەمی بۆ خۆم بژیم**

لە تێکڕای ئەم نموونە شیعرانە مێژووی ئەدەبی کوردی ئەوە بەئێمە پیشان ئەداکە: بێکەس وەکو چۆن شاعیریکی نیشتمانی بووە بەرزتر شاعیریکی کۆمەلاٌیەتی و شەعبی کوردیش بووە کەسەری بردبێتە هەمو کوڕێکەوە و چاوی بە کردەوەی هەموو جۆرە کەسێکا خشاندبێت و گوێی بە توانجی کەس نەدابێت و دلٌ و زمانی وەکویەك بوبێت و سەری لە کەس نەکردبێتەوە، یا بە کورتی بڵێین: کەم و کوڕی دەستەی مەردمی دەر بڕیبیٚ بۆ ئەوەی پڕی بکەنەوەو لەو پڕکردنەوەدا ولاٌتەکە پێش کەویٚ...

بێکەس لەمانە هەموو بەرزتر ئەڕواو شعوری زیاتر ئەئاڵینی بە دەورەی فیکری شیعری ورددا.

شەوە، دنیا سافە ئاسمان بێگەردە، سایەقە سامالٌ دلٌ پڕ لە دەردە. تریفەی مانگەشەو لە توی فێنکی، ئەکشێت و ئەروا هەردە بە هەردە!.

ئەو خاڵە ڕەشەی ڕومەتی ڕونی، دڵی بیٚ کەسی خستە زەبونی. لەسەربانەکە لە ناو جێگەکە، ئەکەوێتە گیر دەرباری زەبونی!. سەیری مانگەکە ئەکا کە ڕومەتی شینی هەڵگەڕاوەو سەیری دڵی خۆی ئەکا کە لە سۆزو گودازێکا هەڵقرچاوە ڕوی دەمی تیٚ ئەکاو ئەڵیٚ:

**ئەی مانگ! من و تۆ هەردو هاو دەردین　　هەردو گرفتار یەك ئاهی سەردین**
**تۆ وێلٌ و ڕەنگ زەرد بە ئاسمانەوە　　منیش دەربەدەر بە شارانەوە**

دەخیلتم! ئەی مانگ قبلەی دڵداران    دەرمانی دەردی دڵی بیماران
شەوێکە و ئەمشەو بگەرە فریام    بێ یار و هاودەم، عاجزو تەنیام
دڵزارو بێزار، خەیلی غەمگینم    گیرۆدەی داوی لەیلی شیرینم
دڵ بەندی عەشقی ئەو بەڵەك چاوەم    شێت و شەیدای ئەو ئەگریجە خاوەم
لەو ساوە ئەوم کەوتۆتە خەیاڵ    گریانە، پیشەم بومە کۆی زوخاڵ!
ئەی مانگ! تۆ شوعلەی عەشقی پیرۆزی    تۆ نەشئە بەخشی دڵی بە سۆزی
قەسەمت ئەدەم بە عشق و جوانی    بە نەسیمەکەی بەری بەیانی
بەسەرهاتی خۆت بۆ من بەیان کە    دەردی گرانم نەختێ ئاسان کە
توشی چی بوی تۆ وا پەشێواوی    لە بەرچی پەست و مات و داماوی؟
پێم بڵێ! توخوا چەن جوانانت دی؟    چەن جوتە یاری دەس لەملانت دی؟
چەن کۆڕی بەزمی عاشقانت دی؟    چەن تەخت و بەخت و خانمانت دی؟
چەن قارەمان و چەن سوڵتانت دی؟    چەن قەوم و میللەت، چەن شارانت دی؟
چەن شەڕو شۆڕی بێ ئامانت دی؟    چەن بوردمانی کوردستانت دی؟!
چەن کفنی ئاڵی شەهیدانت دی؟    چەن بێ کەسانی پەرێشانت دی؟
چەن دەربەدەرو ماڵ وێرانت دی؟    چەن چاوی سوری پرگریانت دی؟!
ئەی مانگ! ئەوەندە سەیری دنیات کرد    سەیری نفاق و زوڵم و ریات کرد
بۆیە بەم ڕەنگە کاری لێ کردی    ڕەنگ و شعوری بەجارێ بردی!

ئیمە لەم شیعرانەدا نامانەوێ لەوە بکۆڵینەوە کە ئایا لە بابەت وشە، یا وەزنەوە گرانی و سوکی، یا کەم و کوڕیەکی هەیە، چونکە لە وەزندا هەمو لایەکی گرتۆتەوە، لە وشەشدا دیارە بێکەس کە خاوەنی ئەم شعرانەو گەلێ شیعری تریش بێ ئەیتوانی لێرەدا هەندێ وتە بگۆڕێتەوە بە هەندێکی‌تر، بەڵام کە نەیکردووە وەنەبێ ئەم نەکردنەی زیانێکی بە ئەدەبی کوردی گەیاندبێ!. بەڵکو ئیمە تەنها ئەوە ئەخەینە بەرچاو کەمەگەر فیکری شاعیرێکی وەکو بێکەس لەم سەدەی بیستەمەدا و لەم ڕۆژەلاتەدا بۆ ئەوە چوبێ کە سکالایەکی بەم جۆرە لەگەڵ مانگدا بکاو بتوانێ مانگ لە بەرزی و خۆی لە ئەرزی لەگەڵی ڕێ کەوێ ولە هەردەگەڕێ، و دەربەدەرییدا بن بە یەك، وە ئەو بە ڕەنگی زەردەوەو ئەم بەدڵی پڕ لە دەردەوە ئاهو ناڵەیان بۆ یەك هەڵڕێژن و ئەم بیخاتەوە بیری‌کە چەند شاسواران و کولاهدارانی چاو پێ‌کەوتوە؟ چەند نەمامی باخچەی ژیانی بەهەڵپرۆکاوی دیوەو؟ چەند شەهیدانی ڕێی ئازادی وچاوی پڕ لە خوێنی نامرادی دیوە؟!.

ئەویش بیخاتەوە بیری ئەم کە: لەیلی شیرین و عەشقی چاوی ڕەنگین و ئەگریجەی سەرخاڵ و خاڵی گۆنای ئاڵ نا گونجی بۆ ئەوکەسە کەدەرونی زامداری تیری هەوا ناسیی دیارانەو لە شیشی دیلی بەندی شارانە!..

بەڵێ"سیرفلیپ سدنی ئینگلیزی1554-1586" ئەویش شیعری"بۆ مانگ"ی هەیە، بەڵام پیاو ئەبێ ئینساف بدا"فلیپ"وەکو چۆن شاعیرێك بو هەروەها قائدو سیاسی و نائبی ناوچەی"کینت"یش بو.

لە ئەکسفورد خوێندبوی و بێجگە لە پاریس هەمو ئاوروپایشی دیبو. ئایا بێکەس چ شوێنێکی چاوپێکەوت، وە لە چ دانشتگا و قوتابخانەیەکی بەرز دەرچوبو؟. ئەگەر تەماشای ئەم دوو پەردەیەبکرێ بێگومان بێکەس گەلێ بلیمەتتر بووە لە"سدنی"!..

ئێستە، کە بمانەوێ تەماشای بێکەس بکەین ئەڵێین: بێکەس لەپێش هەمو شتێکدا شاعیرێکی هەرە بەرزی قەومی سەدەی بیستەمی کوردبووە کە لەم سوچەوە چڵە پۆپەی گرتبێ، لە پاشا ئاوێنەیەکی رونی کۆمەڵایەتیە، لە غەرامدا نەیگەیاندۆتە شاعیرەکانی تر، واتە لە ڕێگەکەی ئەواندا، بێکەس وەکو لە زادەی فیکری خۆی شیعری هەبووە هی وەرگیراوی عەرەبی و فارسیشی هەبووە. دیسان هەر لە فیکری خۆی شیعری عەرەبیشی هەیە. لە کۆمەڵە شیعرە بەرزەکانی دیوانێکی نایابی دروست کردووە هیشتا لە چاپ نەدراوە...

**سەرچاوە**

مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلادین سەجادی،

# بێکەسی شاعیری خەباتکەر

ئیبراهیم ئەحمەد

١٩٥٨/١٢/١٨

بێکەس بەلای منەوە لە دوای حاجی قادری کۆیی یەکەم شاعیری نیشتمانیی کوردە کە ئالآی بوژاندنەوە و وریا کردنەوەی بیروباوەڕی کوردایەتی هەڵگرتبێ، بێباك لەهەموو سەختی و تاڵی و نالەباریەکی ڕێی خەبات وە بە پێچەوانەی هەموو تیرو توانجێکی دەوروپشتی بێکۆڵدان هەر لەو ڕۆژەوە دەستی کردۆتە شیعروتن تا ئەو ڕۆژەی مەرگی بێئەمان دەمی پێلێکنا، ئەم ئالآ پیرۆزەی دانەنا هەمیشە رزگاری نیشتمان و بەختیاری گەل کەڵکەڵەی هەرە گەورەی مێشك و ئاواتی هەرە بەرزی ژیان و وێردی دەم و زمانی بوون. وەکو لە بەندیخانە لە(١٩٣٠)دا لەو شیعرەیدا کە بەبۆنەی کارەساتی ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلولەوە دایناوە ئەڵێ:

**من لە زیکرو فیکری تۆ غافڵ نەبووم واتی‌نەگەی**
**حەپس و تێ هەڵدان و زیللەت تۆی لەبیربردۆتەوە**
**بەو خووایەی بێ‌شەریك و لامەکان و واحیدە**
**عەشقی تۆ نەوعێ لەدڵما ئاگری کردۆتەوە**
**ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر**
**قەت گڕو کڵپەو بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە**

لەگەڵ ئەمەشدانابێ واتێبگەین کە بێکەس هەر بە دەم کوردایەتی کردوە وەهەر بە شیعر خەڵکی هانداوە بۆ خەبات کردن بەرامبەر بە ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی نۆکەری، بۆخۆ ڕزگارکردن لە کۆتەی دیلی و هەژاری و نەزانی و نەخۆشی، بەکردەوەش یەکێك بوو لەوانەی لە ڕیزی یەکەمی بزووتنەوەی کوردایەتیدا خەباتیان ئەکردوو هەمیشە وەکو لە شیعرەکانیا ئەڵێ لەو باوەڕە لای نەئەدا کە:

**(لافی میللیەت بەدەم لەم عەسرەدا کەڵکی نی‌یە**
**ڕۆژی هەوڵە هەر بە هیمەت گۆی هونەر ئەبرێتەوە)**

**"(داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێت قەت بەرناگرێ**
**سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ**
**پیاو ئەبێ بۆ سەندنی هەقی لە مردن سڵ نەکا**
**هەر بڕوخێ بەس نی‌یە، تاکو نەسەندرێ نادرێ)**

لەو بەربەرەکانییەدا کە کورد کردی بەرامبەر بەبەستنی پەیمان(١٩٣٠) لەبەینی حکومەتی نیشتمان فرۆشی عێراق و بەریتانیادا(بێکەس) یەکێك بوو لە پێشرەوە ڕاستەقینەکانی گەل لەو هێرشانەدا کە ئەیبردە سەر قەلآی کۆنە پەرستی و ئیمپریالیزم، بۆیە کە دوژمنانی کورد و عەرەب کوشتارەکەی شەشی ڕەشی ئەیلولیان کرد بەونیازەی تۆوی دوژمنایەتی‌یەکی خوێنین لە نیوان دوو نەتەوەدا بچێنن، بێکەس یەکێك بوو لەو خەباتکارە گیراوە بەندکراوانە کە نۆکەرانی ئیستعمار ئەیانویست دەستە خوێناویەکەی خۆیانیانی پێ بسڕن ئۆباڵی کوشتارەکەیانی بخەنە ئەستۆ. بەلآم تەوژم و هێزی کوردایەتی لە ڕاپەڕینی شێرانەی خواڵێ خۆشبوو شێخ مەحموودی نەمر حکومەتی خوێن خۆری نوری سەعیدی ناچارکرد کە گیراوان بەربدا وەکەوتنەکەی خۆی دیزەبەدەرخونە بکات بۆ ئەوەی لەوەزیاتر ڕیسوا نەبێ وەنەختێ ڕق و دوژمنایەتی خەڵك دامرکێنێتەوە.

(بێکەس) لە ڕێگای ئازادی پەرستی و نیشتمان پەروەریدا هەموو ژیانی پێکرابوو بە ئازارو دەردو ناخۆشی و دەربەدەری. نەك هەرژیانی تەنانەت دوای مردنیش دوژمنانی گەل وازیان لێ نەهێنا ئەمری گرتنیان بۆ دەرکردبوو کە بگیرێ و بدرێ بەدادگای عورفی لەگەڵ ئەمەشدا بێکەس وەکو هەموو خەباتکارێکی نەبەزی خاوەن بیروباوەڕ دەربەدەری و ناخۆشی ولاتیو برسێتی و تەنگ پێهەڵچنین تا ئەهات زیاترهانیان ئەدا وەقاڵتریان ئەکرد، بۆیە هەر دوای ئەو گرتنەی(١٩٣٠) تەخمیسی پارچەی شیعرە جوانەکەی پڕ هێزو بیری شۆڕشگێڕانەکەی(پیرەمێرد) بوو کەبۆ ئەو وەفدەی وتبوو دوای کوشتاری شەشی ئەیلول چوونە بەغدا بۆ بەپیرەوە چوونی(فەیسەل) لەوێدا ئەڵێ:

**قەت واتی‌نەگەن چاومان شکاوە**
**کوشتن و بڕین دائیم بۆ پیاوە**
**لەناو دۆشەکا کەی هەق سەنراوە**
**(خەیاڵتان خاوە کورد نەفەوتاوە**
**بەراتی نەجات بەخوێن نووسراوە)**
**میللەت مەتینە عەزمی نانەوێ**
**لەغایەی بەرزی خۆی هەرناکەوێ**
**لەتوپەتکرێ حقوقی ئەوێ**
**(من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ**
**مژدەی شەفەقی لێ دەرئەکەوێ)**

هەروەها(بێکەس)ئەو هەموو کوشتن و برین و هەڵواسینو ڕەوپێکردنەی دووچاری نەتەوەکەی ئەبوو لە ڕێگەی بەگژاچوونی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستیدا ئازاترو توندترو تیژتر ئەبوو، بڕوای بە نزیك بوونەوەی ڕۆژی ڕزگاری زیاترو پتەوترئەبوو داوای مزگێنی ئەکرد بۆ هەواڵی ئەو قوربانیانەی کەنەتەوەی کورد بە هەموو کوڵی دڵەوە پێشکەشی ئەکرد لە پێناوی ئازادی و ئاشتیدا، بۆیە ئەبینین کەباسی کوشتاری ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلولمان بۆئەکات لە شێوەی مژدەیەکی تابڵێی خۆشا ئەی گێڕێتەوە کەئەڵێ:-

**(ماتەمی تابەکەی دەی پێ‌کەنەو سەر هەڵبڕە**
**موفتەخیر بە شوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە**
**نەگبەتی لاچوو، سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ**
**کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە ئەدرەوشێتەوە**
**بێ قسورە چەن جەسوورە سەد شوکر ئەولادەکەت**
**وا لەڕێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە)**

ئا ئەوەتە بەهۆی هەڵواسینی چوار جوانە مەرگە شەهیدەکانمان

(عیزەت و خۆشناو وقودسی و خیراللە) وە ئەڵێ:-

**(قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین**
**میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین**
**میللەتێ لاوی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان**
**بێتە بەرسێدارە بێ ترس دەم بە خەندەو پێکەنین**
**قەومی وانامرێ ئەژی بادوژمنانی هەر شەق بەرێ**
**ساحبی ڕۆڵەی نەبەردە خاوەنی عەزمی مەتین)**

جگە لەمە بێکەس وەکو نیشتمان پەروەرێکی راستەقینە بڕوایەکی نەگۆڕی هەبوو بەبرایەتی گەلان و یەکێتی خەباتیان لە ئاشتی و ئازادی و دیموکراسی بەتایبەتی یەکێ بوو لەلایەنگرە ڕاستەقینەکانی برایەتی کورد و عەرەب وەهەمیشە لەوبیرەدابوو کە ئەگەر ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی نۆکەری لەناوا نەهێلرێن بناغەیەکی مێژوویی بۆ ئاشتی و خۆشی پتەوفراوان هەیە لە نێوان نەتەوەی کورد و عەرەبدا بۆ ئەوەی کۆشکی پێکەوە ژیانێکی پڕ کامەرانی و ئازادی و وەك یەکمان لەسەربنیات بۆ بکرێ و هەربەم سەرنجە فراوانە پڕ برایەتی و هیوایە ئەم شیعرانەی کە بە بۆنەی ڕاپەڕینەپیرۆزەکەی کانونی دووەمی(١٩٤٨) ەوە وتویەتی:

**ئەم عێراقە خۆشەویستە خاکی گوڵ گوون بوو بە خوێن**
**تاهەقی دەسگیر نەبێ لەم خوێنە دەس هەڵناگری**
**گلۆڵەی کەوتە لێژی باوی ئیستعمار نەما**
**هیچ کەسێك ئیتر بەزوڕناو تەپڵی ئەو هەڵناپەڕێ**

داخی بەجەرگ بێکەس نەژیا تاببینێ چۆن، قسەکانی هاتەدی و گەلی عێراق دەستی لەخوێنی ئازادی و شەهیدانی هەڵنەگرت تاگەیشتە سەربەخۆیی و ئازادی ودامو دەزگای زوڵم و ئیمپریالیزم و نۆکەرانی تێکومەکاندا، لاشەی خوێن خۆرانی گەل و سەرانی حکومی و بوگەنی پاشایی هەپروون بە هەپروون کرد لە خاکی پاکی خۆیان گوریچەیەکیشی پێپیس نەکردن، داخی بە جەرگ بێکەس مرد، چاوی بەم نۆبەرەی خەباتی یەکگرتووی کورد و عەرەبە نەکەوت کەیەکێ لە ئامانجەکانی جێبەجێکردنی مافە نەتەوایەتیەکانی کوردە لە سنووری عێراقدا. ئەو مافە نەتەوایەتیانەی(بێکەس)ی نەمر بە درێژایی ژیانی خەباتی بۆ ئەکرد.

دوا شیعری بێکەس لەو نمونانەدا کە باسمان کرد ناچارم ئەکات کە سەرنجتان ڕاکێشم بۆلایەك کە ڕەنگە لای هەندێ کەس هیچ پەیوەندیەکی بە بیرەوەری بێکەسەوە نەبێ ئەویش ئەو شیعرەیەتی کە ئەڵێ:-

**(وا گلۆڵەی کەوتە لێژی باوی ئیستعمار نەما**
**هیچ کەسێ ئیتر بەزوڕناو تەپڵی ئەو هەڵناپەڕێ)**

ئەم ڕایەی بێکەس لەم شیعرەیا دەری بڕیوە یەکێکە لەو ڕایانەی لە دوای ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی(١٩٤٨) لەناو نیشتمانیەکانا بڵاوبوەوە، و لە مێشکی زۆریاندا بە جۆرێکی لەبن نەهاتوو جێگیربوو بوو.

بێکەس وەکو شاعیرێك پەیوەندیەکی توندو نەپساوەی هەبوو لەگەڵ گەل، هەمیشە دەربڕی بیروباوەرو داڕێژەری ئازارو ئاواتی هەموان بو، بۆیە شیعرەکانی لە هی هەمو شاعیرێکی کە زیاترو زۆرتر بڵاوئەبوەوە بەناو خەڵکا، ئەو خەڵکەی کە ئەو شیعرانە سکاڵای دەردی دڵ و ئاوێنەی هیواو ئامانج و دەرخەری بیرباوەڕی بوون.

ئەوەی وام لێ ئەکات لەسەر ئەم شیعرە بدوێم ئەوەیە کەوەکو هەموومان بە چاوی خۆمان دیمان زۆر بەهەڵە چووبووین لەم ڕایەدا و دوژمن وا گلۆڵەی نەکەوتبوە لێژی، وەکو ئێمە بەبیرماندا ئەهات وەلە ئەنجامی ئەم دوژمن بەکەم زانین و خۆ بەزل دانانەدا گەلی عێراق بە کورد و عەرەبییەوە دوچاری دەردو ئازار و کوشتن و گرتنێکی زۆری وابوو کە بۆ ماوەی دەساڵ خستیەوە ژێرچنگی ئیمپریالیزمی خوێن مژو نۆکەرانی نیشتمان فرۆش، ئەمە وامان لێ ئەکات کە بەوپەڕی هێزو توانامانەوە بچین بەگژ ئەم چەشنە خۆ بەزل دانان و دوژمن بە کەم زانینە بێجێیە، بەتایبەتی دوای ئەوەی سەرەتای کارە ناپەسەندەکانی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی دەرکەوت و بۆی ڕوون کردینەوە کە ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستیوا بە ئاسانی لەناو نابرێن وەلەشکانیانا گلاوترو پیسترو بێ ویژدان ترئەبن، بۆیە پێویستە لەسەرمان لەسەرهەموو هاوبیرێکی بێکەس، لەسەرهەموو هاونیشتمانێکی خەباتکار بەوپەڕی ئاگادارییەوە ئاگاداری هەموو جوڵەو کارێکی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی بێت، پێویستە لەسەر هەموو هێزە نیشتمانیەکان بەو پەڕی وردی و ڕاستیەوە تەماشای هێزی خۆمان و هێزی ئیمپریالیزم و کۆنە پەرستی بکەین وە هەرگیز ماوەنەدەین کە پیالەی سەرکەوتن مەستمان کات و دوژمن کەوەکو ماری کەسیرەیە بە مردوو بێ کێش بزانین! بەمە ئەتوانین لە هەموو شتێکی تر زیاتر نرخ بدەین بەبیرەوەری(بێکەس) شاعیری خەبات کاری کوردەواری.

ئیتر بژی یادی شاعیری نەمری کوردایەتی(بێکەس)

### سەرچاوە

دیوانی بێکەس، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، چاپی یەکەم، (بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، زنجیرەی ژمارە (٢٧)، سلێمانی (١٩٩٩).

# نموونەیەک لە شیعرەکانی بێکەس

## ئەی وەتەن...

ئەی وەتەن مەفتونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە
وەختی بەندیی و ئەسارەت، پێ بەتەوق و کۆتەوە
من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێ نەگەی
حەپس و تێ هەڵدان و زیللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە
بەو خووایەی بێ شەریك و لامەکان و واحیدە
عەشقی تۆ نەوعێ لە دڵما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر
قەت گڕو گڵپە و بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە
باسی مەحزوونی و کەساسیی خۆت نەکەی توخوا وەتەن
چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە
ماتەمینی تابەکەی، دەی پێکەنە و سەر هەڵبڕە
موفتەخیر بەشوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە
نەگبەتی لاچوو سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ
کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە ئەدرەوشێتەوە
گەرچی بەینێکە زەلیل و دیلی دەستی زاڵمی
نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحەزت لێك بێتەوە
لافی میللییەت بەدەم لەم عەسرەدا کەڵکی نییە
ڕۆژی هەوڵە هەر بەهیممەت گۆی هونەر ئەبرێتەوە
بێ قوسوورە چەند جەسوورە سەد شوکر ئەولادەکەت
وا لە ڕێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە
بەسیە تەعنەم لێ مەدە هەر ڕۆڵەکەی جارانتم
هێندە حیلمت بێ هەتاکو دەست و پێم ئەکرێتەوە
شەرتە شەرتی پیاوەتی بێگەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت کەم وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە...

سلێمانی - ئەیلوولی ١٩٣٠

## وەفدی کوردستان

قەدری میللەتان بەجارێ شکان
نە حەیاتان ما نە ناو و نیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەر شان
"وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان"

. . .

حاجی تووتنەکەت مادەم فرۆشرا
قیروسیا لە صەد کوشتن و هەرا
دەخیلە هەستە رێکەوە خێرا
"دەسکێ لەو گوڵەی باغەکەی سەرا
کەوا بەخوێنی لاوان ئاودرا"

. . .

تاقمێ ڕێك خەن زۆر بەپڕ لاقی
بەبەزم و ڕەزم و ئاهەنگ وساقی
بۆ ئەوەی بکەن دەفعی مەراقی
"بیبەنە بەردەم عەرشی عێراقی
بڵێن یار باقی و، هەم سوحبەت باقی"

. . .

نەبارانتان دی، نە با ئەی فەقیر
نە لاوان کوژران بەگوللە و شەستیر
نەپێی نازداران خرایە زنجیر
"پەردە و تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن دوای کوشتار هێشتا تۆی دڵگیر؟"

. . .

هاوار بە ماڵم چیمان پێ کرا
لە چارەکێکا سەدمان لێ خرا
هێشتا خەڵاتیان ئەکەن بە بەرا
"دەك خەجاڵەت بن لە ڕۆژی مەحشەرا
ئێمەیش خاکی غەم ئەکەین بەسەرا"

. . .

قەت وا تێ نەگەن چاومان شکاوە
کوشتن و بڕین دائیم بۆ پیاوە
لەناو دۆشەکا کەی حەق سەنراوە؟
"خەیاڵتان خاوە کورد نە فەوتاوە
بەراتی نەجات بەخوێن نووسراوە"

. . .

میللەت مەتینە عەزمی نانەوێ
لەغایەی بەرزی خۆی هەر ناکەوێ
لەت و پەت کرێ حقووقی ئەوێ
"من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ
مژدەی شەفەقی لێ دەرئەکەوێ"

سلێمانی-١٩٣١

## دەردی دەروون

کورد ئەبەد ناگاتە مەقسەد نۆکەری بێگانەیە
دوو دڵن پیسن لەگەڵ یەك، بۆیە وا بێ لانەیە
میللەتێکن بۆ نەمانی یەکتری هەر هەوڵ ئەدەن
داخەکەم ورد و درشتی شێت و شەیدای ئانەیە

سەنعەت و عیلم و مەعاریف زەڕڕەیەك باوی نییە
پیاوەتی لایان بەتەنها چەفتە و جامانەیە
بۆ قسەی زل بێ قسوورن، باسی کوردییەت ئەکەن
کوردییەت خورمایە بۆچی، یا قسەی شێتانەیە
میللەتی بێ عیلم و ئەخلاق چۆن بە ئیستقلال ئەگا
واسیتەی بەرزی و تەرەققی هیممەتی مەردانەیە
سلێمانی

## چاوبەست

دەنگ بڵاوە خەڵق ئەڵێن ئەم جارە کورد سەربەست ئەبێ
چی ئەڵێن، بیڵێن، لە لام وایە درۆ و چاوبەست ئەبێ
صەد هەزار جارمان سیاسەت تەجروبە کرد و کەچی
ئێستەکەش زۆرمان بەفیشاڵی وەها سەرمەست ئەبێ
بێت و بەینی ... و... زەڕڕەیەك تێك چی ئیتر
مەسئەلەی کوردایەتی ئەوسا بەجارێ خەست ئەبێ
کەی حوقووق ئەدرێ؟ ئەسەنرێ. عەیبە ئیتر تێ بگەن!
سەربەستی چۆن نسیبی قەومی وا بێ دەست ئەبێ
میللەتی جاهیل لە دنیادا ئەبێ هەر بەندە بێ
نۆکەری هەر خشت بەبالأی قەومی دیل و پەست ئەبێ
سلێمانی- ١٩٤٤

## بیست و حەوت ساڵە

١

بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم
بەنان و ئاو و جلوبەرگی خۆم
خزمەتم کردی لە ئێران و ڕۆم
لە پێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم
کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

٢

بیست و حەوت ساڵە من ئەڕەتێنی
بەفر و فیشاڵ ئەم خەڵەتێنی
ڕۆژی نەوعێکم هەڵ ئەپەڕێنی
بۆ مەرامی خۆت ملم ئەشکێنی
کە ئیشت نەما وازم لێ دێنی
گوناهم چی بو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

٣

بیست وحەوت ساڵە من تووشی تۆ بووم
لە ڕێی ژیانا هیچ پێش نەکەوتووم
لات و پەژموردەم. هەروەکو مردووم
قسەی خۆمان بێ حەشرت پێ کردووم
هیوام نەماوە، تازە لە دەست چووم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

٤

بیست و حەوت ساڵە تاڵە ژیانم
لەژێر دەستیی تۆ زۆر پەرێشانم
لە ئینسان ناچم، عەینی حەیوانم
کەی ڕزگار ئەبم ماڵی وێرانم؟
وا بەخۆت ئەڵێیت(حامی)ی گەلانم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

٥

بیست و حەوت ساڵە من بەتەمامتم
چاوەڕێی نەختێ لوتف و خەڵاتم
ببوژێتەوە خاکی ولاًتم
هیچ گوێ نادەیتە دەرد و ئاواتم
چونکە ئەیزانی بێ دەسەڵاتم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

٦

بیست و حەوت ساڵە زووخاو ئەنۆشم
لە زوڵم و جەورت هەر چاو ئەپۆشم
بۆ ڕەزامەندیی تۆ تێ ئەکۆشم
لەبەر تۆ زەربەم داوە لە خۆشم
واتێ گەیشتم کە چەند بێ هۆشم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

٧

بیست و حەوت ساڵە تەفرەی خۆم داوە
وازم لە هەموو کەسێك هێناوە
تۆم گرتووە و، دنیام خستۆتە لاوە
بۆیە پێم ئەڵێن کەر و ڕێشگاوە
ئەوی تۆی ناسی ملی شکاوە
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

۸

بیست و حەوت ساڵە دەم بەهاوارم
جاریٚ ناپرسی لە حاڵی زارم
سووتام، پڕووکام زۆر بیٚ قەرارم
ئەزانی لە تۆ بۆچی بێزارم؟
شارەزای دەردمی. ناکەی تیمارم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم؟!

۹

بیست و حەوت ساڵە بەبیٚ زیاد و کەم
ئەپاڕێمەوە. هەر هاوار ئەکەم
یاخوا کافریش نەبیٚ بەجەستەم
وێڵ و سەرگەردان بیٚ تین و خەستەم
هیچم پیٚ ناکریٚ، دیل و دەست بەستەم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

۱۰

بیست و حەوت ساڵە دڵم لێت پڕە
ئەحواڵم بە دەست تۆوە زۆر شڕە
صەد بەڵێن بدەی لەلای من تڕە
بەسیەتی ئیتر ئەم وڕە- وڕە
نۆکەریت ناکەم ورگم هەڵدڕە
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

۱۱

من ڕەنجبەرێکم پاک و بەسەزمان
هەوڵم بۆ داوی بەدڵ و بەگیان
بەسیەتی ئیتر درۆ و تەفرە دان
وا ئەبیٚ عەدل و ئینساف و ویجدان
ئەمکەی بە دیلی(عێراق) و (ئێران)
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم؟!

سلێمانی۱۹٤٦

## قەومی کورد...

بەبۆنەی هاتنەوەی لاشەی چوار
ئەفسەرە قارەمانەکەوە بۆ سلێمانی لە
ساڵی ۱۹٤٧دا وتراوە
قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین
میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبیٚ سەربەست بژین
میلەتیٚ لا وی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان
بێتە بەر سێدارە، بیٚ ترس، دەم بەخەندە و پێکەنین
قەومی وا نامریٚ، ئەژی، با دوژمنی هەر شەق بەریٚ
ساحێبی ڕۆڵەی نەبەرد؟ خاوەنی عە زمی مەتین
ئەو کەسەی گیانی لە ڕێگای نیشتمانا بەخت ئەکا
پێی مەڵێن مردوو، شەهیدە وا لە فیردەوسی بەرین
لاوی کورد مەردە لە مردن قەتعییەن باکی نییە
پەندی پێشینانە، ڕاستە(بەرخی نێر بۆ سەربڕین)
وا وەتەن دیسان بەمەحزوونی ئەڵیٚ ئەی لاوەکان
بۆچی وا مات و مەلوولن، بەسیەتی شین و گرین
ڕۆژی تێکۆشانە سا دەی هیمەتیٚ تاکو زووە
بەشکو لەم حاڵە نەجاتمان بیٚ و لە دیلی دەربچین
گەرچی هەندیٚ کەس خەریکن ورگ و گیرفان پڕ ئەکەن
شەو بەبیٚ خەم سەر ئەنێنە سەر سەرین، هەر سەرسەرین
پیاو ئەبیٚ دائیم خەمی قەوم و وڵاتی خۆی هەبیٚ
ئەو کەسانەی بیٚ خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکە نین...

## داری ئازادی

داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدریٚ قەت بەر ناگریٚ
سەربەخۆیی بیٚ فیداکاری ئەبەد سەرناگریٚ
پیاو ئەبیٚ بۆ سەندنی هەقی لە مردن سڵ نەکا
هەر(بڕووخیٚ) بەس نییە، تاکو نەسەندریٚ نادریٚ
کورد ئەگەرچی موددەتێکە دیل و داماوە، بەڵام
باوەڕت بیٚ ڕۆحی میللی هەر ئەمێنیٚ نامریٚ
تۆ ئەگەر ئیسلاحی قەوم و نیشتمانی خۆت ئەویٚ
لێت موحەققەق بەبیٚ شۆڕش مەحاڵە ناکریٚ
بیری ئازادی جیهانی گرتەوە، توخوا بەسە
ئەم نیزامە کۆنە تاکەی؟ هیممەتیٚ کەن لابریٚ
قەت مەڵێن دوژمن بەهێزە تۆپ و تەییارەی هەیە
ئیتیفاقتان گەر هەبیٚ زۆر زەحمەتە خۆی ڕاگریٚ
ئەم عیراقە خۆشەویستە خاکی گوڵ کوون بوو بەخوێن
تاحەقی دەسگیر نەبیٚ لەو خوێنە دەست هەڵناگریٚ
نێر و میٚ هەردوو بەجووتە بۆ وەتەن هەوڵیٚ نەدەن
دوورە دەرچوونی لە دیلی، مەل بە باڵیٚ نافڕیٚ
هەوڵی ڕاستی هەردوو لا ئامانجی میللەت سەر ئەخا
چونکە مەعلوومە بەیەک دەست چەپڵە قەت لیٚ نادریٚ
وا گلۆڵەی کەوتە لێژی باوی ئیستعمار نەما
هیچ کەسیٚ ئیتر بەزوڕنا و تەپڵی ئەو هەڵناپەڕیٚ

دۆستیی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تەئریخ شاهیدە
ناحەزی ڕووڕەش لە داخا با یەخەی خۆی دادڕێ

# نەسرین

نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی، ژیانت زوڵمە
وا من پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

. . .

ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانە
عالەم شەو و ڕۆژ وا لە فرمانە
فەرقی نێر و مێ نییە بیزانە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

. . .

هێندە دانیشتی پشتت چەماوە
زەرد و لاواز بویت هێزت نەماوە
کچی بێگانەت خۆ لەبەرچاوە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

. . .

خشڵ و جوانیی تۆ حەیا و فێربوونە
پاشەڕۆژیشت هەر بەوان ڕوونە
کچی بێ عیلم دیل و زەبوونە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

. . .

وەک خوشک و برا ئەبێ هەردووکمان
قۆڵی لێ هەڵکەین بچینە مەیدان
تا کورد بەرینە ڕیزی میللەتان
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

سلێمانی ١٩٤٤

# ئەی مەلا

ئەی مەلا دیارە خەریکی فیتنەیەک بەرپا ئەکەی
دەوری پاپا و عەسری ئیرهاب لێرەدا ئیحیا ئەکەی
تۆکە هیچ کەڵکت نەبێ غەیرە سووالْ و تەمبەڵی
ئێستە وا هاربووی لەبەرچی پێم بڵێ بۆ وا ئەکەی؟!
تۆ لە باتیی وەعز و ئیرشاد و نەسیحەت کەی، کەچی
بوویتە شەیتانی عەوام و جاهیلان ئیغوا ئەکەی
گا بەنووسینی مەزابیت، گەه بە تەحریکاتی خەڵك
بۆ ڕەزای شەخسیٚ هەزاران ئیشی بێ مەعنا ئەکەی
ئالەتی دەستت، کە کزبووی، دینە تەنها بۆ سووالْ
ڕۆژی دەست داریبیش سیلاحتە و خەڵقی پێ ئیمحا ئەکەی
نووری ئازادی جیهانی گرتەوە، وا تازە تۆ
مەحکەمەی تەفتیشی نەگبەت سەر لە نوێ ئینشا ئەکەی
واز لە عالەم بێنە، دانیشە، بەرۆکمان بەر بدە
مەلعەنەت بەسیە هەتا کەی خۆت وەها ڕیسوا ئەکەی
من نەزانم تۆ بەفیتی کێیە کەوتوویتە سەما
سەگ کە هار بوو چل شەوی عومرە ئەگەر بروائەکەی

# گۆڕان

بەدەسکارییەوە، لە شیعری شاعیری ئینگلیز: ئی. ویلکۆکس وەرگیراوە

گۆڕاوم، وێنەی جاران نەماوم، بینایی چاوم
عەشقت لە دڵما دامردۆتەوە، بێ تین و تاوم
دیسان هەر مەستی بادەی پێشینم، گیانی شیرینم
چەپگەرد ناتوانێ لە دڵمی دەرکا یادی دێرینم
بەڵام خولیاکەی پێشووم نەماوە، هیوام بڕاوە
ژینم هەر وەکو درەختی بێ بەر وشک و بێ ئاوە
چی بکەم داخەکەم ئەو خولیایەی زوو لەسەرم دەرچوو
وێڵم بە دوویا نایدۆزمەوە، ڕۆیی لێم ون بوو
گیانە پێم بڵێ بۆچ وا ئەڕوانی، گۆیا نازانی
دڵیش ئەگۆڕێ، وەک خۆی نامێنێ تاسەی جارانی
تۆ نەختێ سەرنج بدەرە دنیا، هەرچی کەوا تیا
باڵدار و گوڵ و ئەستێرە و دەریا، درەخت و چیا
ئەمرێ، ئەوەرێ، کز و وشک ئەبێ، ئەگۆڕێ جیا جیا
نازار تۆش سەیری ئاوێنە بکەی ئەوسا تێ ئەگەی
خۆشت ئەگۆڕێی، هەروا نامێنی هەتاکو سبەی
منیش ئارەزووی ئەوسام نەماوە، عەشقم گۆڕاوە
دڵم هەروەکو گوڵی بێ باران سیس و ژاکاوە

مۆرتکەی بازیان-١٩٣٥

## زەحمەتە بێ مەی ژیانم

داخی قەرزاریی عەرەق خستوومیە فاك و فیكەوە
گا بەدەس جەرجیس و عەبدە و، گا بەدەس ئۆفیكەوە
هەر كە ڕۆژئاوا ئەبێ من بۆ عەرەق سمكوڵ ئەكەم
وەك ولاخی بێتە وەختی كا و جۆ و ئالیكەوە
چنگ لەسەر شان بۆی ئەڕۆین خۆم و لەگەڵ چەند نەگبەتێ
بۆ پەنا ئاشێ بە مەززە و قاپی مل باریكەوە
جا بەچوار مەشقی لەسەر ئەرز دائەنیشین كۆمەڵێ
بەزمە ئێواران بەدەوری عارەقی مەستیكەوە
خۆشە سەرخۆشی ئەگەر تووشی ڕەفیقی تووش نەبی
ڕابویری هەر بەگۆرانی و قسەی عەنتیكەوە
عارەق و پارە لە هەردوو گەر سەر و ڕوبعم هەبێ
چیمە ئیتر من بەسەر ئەڵمان و رووس و چیكەوە
هەقمە گەر ئارەق بخۆم توخوا ڕەفیق لۆمەم مەكەن
زەحمەتە بێ مەی ژیانم بەم دڵەی تاریكەوە
تشرینی دووەم ١٩٣٩

## ئەی مانگ

ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین
هەردوو گرفتار یەك ئاهی سەردین
تۆ وێڵ و ڕەنگ زەرد بەئاسمانەوە
منیش دەربەدەر بەشارانەوە
دەخیلتم ئەی مانگ قیبلەی دڵداران
دەرمانی دەردی دڵەی بیماران
شەوێكە و ئەمشەو بگەرە فریام
بێ یار و هاودەم عاجز و تەنیام
دڵزار و بێزار پەست و غەمگینم
گیرۆدەی داوی یاری شیرینم
دڵبەندی عەشقی ئەو بەڵەك چاوەم
شێت و شەیدای ئەو ئەگریجە خاوەم
لەوساوە ئەوم كەوتۆتە خەیاڵ
گریانە پیشەم بوومە كۆی زوخاڵ
ئەی مانگ تۆ شوعلەی عەشقی پیرۆزی
تۆ نەشئە بەخشی دڵی بەسۆزی
من سوێندت ئەدەم بەعیشق و جوانی
بە نەسیمەكەی بەری بەیانی
بەسەرهاتی خۆت بۆ من بەیان كە
دەردی گرانم نەختێ ئاسان كە
دوچاری چی بوی وا پەشێواوی؟
لەبەرچی پەست و مات و داماوی؟
پێم بڵێ توخوا چەند جوانت دی؟
چەند جووتە یاری دەس لە ملانت دی؟
چەند كوڕی بەزمی عاشقانت دی؟
چەند تەخت و بەخت و خان و مانت دی؟
چەند قەهرەمان و چەند سوڵتانت دی؟
چەند قەوم و میللەت، چەند شارانت دی؟
چەند شەڕ و شۆڕی بێ ئامانت دی؟
چەند بۆردومانی كوردستانت دی؟
چەند كفنی ئاڵی شەهیدانت دی؟
چەند بێ كەسانی پەرێشانت دی؟
چەند دربەدەر و ماڵ وێرانت دی؟
چەند چاوی سووری پڕ گریانت دی؟
ئەی مانگ ئەوەندە سەیری دنیات كرد
سەیری نیفاق و زوڵم و ڕیات كرد
بۆیە بەم ڕەنگە كاری لێ كردی
ڕەنگ و شوعووری بەجارێ بردی

## بەهار نامەوێ...

بەهار نامەوێ جوانیت ببینم
ئەمرۆ من بە دڵ پەست و غەمگینم
دوورم لە خۆشی. خەریكی شینم
زار و بێزارم تاریكە ژینم
دوژمنی لالە و گوڵ و نەسرینم
بەهار نامەوێ جوانیت ببینم
. . .
بەهار بولبولت با هەر بخوێنێ
گوڵیش لە دەشتا با خۆی بنوێنێ
كانیت ئاوی ڕوون با هەڵقوڵێنێ
گژ و گیات هەوا با بیشەكێنێ
ئەمانە دڵی من نابزوێنێ
بەهار نامەوێ جوانیت ببینم
. . .
بەهار و دەشت و ئاسمانی شینی
بولبول و قومری و گوڵ و نەسرینی
نەشوەی دیمەنی جوان و شیرینی
پەشمە لای كەسێ سەراپا ژینی
پڕبێ لە دیلی و دەرد و غەمگینی
بەهار نامەوێ جوانیت ببینم

# تووشی لافاوی عیلم بووم سەر دانانەوێنم

تووشی لافاوی عیلم بووم و بەلأم زوو دەرپەڕیم
سواری وا پۆڕی جەهل بووم و بەناویا تیٚ پەڕیم
صەد شوکر ئۆخەی نەجاتم بوو لە باسی عیلم و فەن
نام گرن جارێکی تر بۆیە لە کەیفا هەڵپەڕیم
گەرچی تا ئێستا وتوومە! تیٚ بگەن زوو پیٚ بگەن
بەو قسانەم قەتعییەن باوەڕ مەکەن، سەگ بوم وەڕیم
خوێندەواری شێتییە، هەر جەهلە ئینسان سەر ئەخا
گەر لەمەولا ناوی عیلمم برد بزانن سەرسەریم
هێندە تەعقیبی هەقم کرد تاکو نانی خۆم بڕی
سووك و ڕیسوابووم لەناوا گیرەوەی ئاخر شەڕیم
من کە زانیم حاڵی زانا نەفیە. حەپسە- یا شەقە
هەر کیتابێکم هەبوو دوێنیٚ لە داخانا دڕیم
پیاوی دانا عەقڵی دانا زانیی بۆی ناچێتە سەر
بەرگی نادانیی لەبەر کرد بوو بە خاوەن زێڕ و سیم
شەرتە کەربم بارە گوێزم لیٚ بنێن خڕڕەی نەبیٚ
با دەمیٚ زۆر و کەمیٚ وەك بیٚ غەمیٚ بۆ خۆم بژیم
من کە ڕازی بم بەنەختیٚ عەرەق
بەچۆریٚ چێشت و لەتیٚ نانی ڕەق
کەڵکەڵەی پارەم لە سەردا نەبیٚ
حیس و تەماعم دابێتە بەر شەق
سەر بۆ هیچ کەسیٚ دانانەوێنم
تەشی ناڕێسم بۆ پیاوی ئەحمەق
بەنێری ئەژیم هەتاکو ماوم
ئەبەد لانادەم لەسەر ڕێگەی حەق...

# گۆرانی سپۆرت

یاری کە، ڕاکە پێکەنە
جلی بێکاری داکەنە
دەماری سستی هەڵکەنە
یاری کە، ڕاکە، پێکەنە

. . .

تۆپێن و کەوشەك و شەقێن
یارییێکی زۆر جوان و بەجێن
تەوژم و تین ئەدەن بەخوێن
یاری کە، ڕاکە، پێکەنە

. . .

داوێنی ڕاستی بەرمەدە
لە یارمەتیی خۆت لامەدە
خاوو خلیچك خۆت بامەدە
یاری کە، ڕاکە، پێکەنە

. . .

جوانیی ڕەوشت و کردەوە
بۆ ناو و بەرزی پێشڕەوە
بە گورجی و گوڵی سەرکەوە
یاری کە، ڕاکە، پێکەنە

. . .

ئەگەر پێویستی خۆتت کرد
گەلت هەموو درشت و ورد
ئەڵێن بژی لاوچاکی کورد
یاری کە، ڕاکە، پێکەنە

# بەبۆنەی بۆمبای ئەتۆمەوە

داخەکەم بۆ ئەو زەمانەی ڕووی زەمین
وەك بەهەشت بوو پڕلە خۆشی و پێکەنین
بیٚ تەماع و بیٚ درۆ و خاڵی لە قین
دڵنیا و، دووربووین لە ئۆتۆمی لەعین
تف لە عیلم و سەنعەت و صەد کارەبا
مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت مەرحەبا
یادی تۆ ئێستا لە دڵ خەم لائەبا

. . .

عیلمە ئێستا بۆتە مایەی دەردی سەر
عیلمە بۆتە واسیتەی مەحوی بەشەر
عیلمە تەسخیری ئەکەن هەر بۆ زەرەر
عیلمی چی؟ وابیٚ. هەزار خۆزگەم بەکەر
با وجوودی ڕادیۆ و شەمەندەفەر
تف لە عیلم و سەنعەت و صەد کارەبا
مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت مەرحەبا
یادی تۆ ئێستا لە دڵ خەم لائەبا

سلێمانی ١٩٣٥

## دایک

منالێکی ساوا بووم
کەی وەک ئێستاکە وابوم
دایکم بەخێوی کردم
ئەو نەبوایە ئەمردم

. . .

بەلای لایە و گۆرانی
ڕای ژەندووم تا بەیانی
بەشیری مەمکەکانی
منی بەبەرهەم هانی

. . .

ڕەنجی لەگەڵ کێشاوم
لە باوەشیا داناوم
بەرگ و جلی بۆ شتووم
خزمەتی زۆری کردووم

. . .

چاکەی وا لەبەرچاوم
هەتا لە دنیا ماوم
ئەبێ دڵی نەشکێنم
ئارەزووی بەجێ بێنم

مۆرتکە ١٩٣٥/١/٢٩

## هەر مووز

کوڕێ بو ناوی دارا بوو
وریا و زیرەک و دانا بوو
هەرچی ئەکەوتە بەرچاوانی
ئەچووە بنج و بناوانی
ڕۆژێک ئەوا دیققەتی کرد
تەنیا مێرووله‌یە کی ورد
لە دەنکە گەنمێ ئالاوە
زۆر بەدەستییەوە داماوە
چەندی ئە کرد بۆی نەئەبرا
هێزو قووەتی لێ برا
ئەمجا مانوو بو لێی دا ڕۆیی
هیی تری هێنا لەگەڵ خۆی
چوونە سەری و کاتێ زانی
گەنمیان برد بەئاسانی
دارا لەمە عیبرەتی گرت
پەندێکی باشی لێ وەرگرت
وتی هەر کارێ گرانە
بەهەرەوەزی ئاسانە...

سلێمانی

## مەتەڵ

بۆ کەسێکی ورد و وریا و زیرەک و ساحێب عەقڵ
هەڵبهێنێ ئەم سوئالەم، هەم بدا جوابی بەدڵ
ئەسپی بێ ئێسقان و ڕۆحم لا هەیە، هەم بێ زوبان
سووک و خێرایە لە ڕۆیین، مەحکەم و گورج و ڕەوان
ئەسپی من دائیم لە غارە، باکی هیلاکی نییە
بێ خەو و خواردن، وە بێ دەنگ، کاو و ئالیکی نییە
مەیتەر و زین و تەویلە، ئەی برا لازم نییە
ئاخوڕ و ڕەشمە و لغاوی هەروەها پێویست نییە
فرکە فرک و ڕەوتی تیژی هەر وەکوو بەرقی بەهار
نرخی هەرزان و بە تالان، قایم و دایم بەکار
من مەتەڵ زوو هەڵدەهێنم، هەم ئەدەم جوابت بەدڵ
(ئەسپە ئاسنینە)ی بەکوردی پێی ئەڵێن، یا(پاسکیل)

## کەر

کەریش ئەڵێ زەڕ زەڕ زەڕ
حەیوانێکم لاڵ و کەڕ،
ئیشی زۆرتان بۆ ئەکەم،
بەسەزمانم وەکو مەڕ!!

## پشیلە

پشیلە ئەڵێ میاو میاو
نە نانم هەیە نە ئاو،
تیکەیەک نانم بەرێ
با لێت نەکەم بە زووخاو!
کەڵە شێر
کەڵەشێر ئەڵێ عوو عوو عوو
نوستن بەسە هەڵسن زوو،
نوێژی بەیانیتان چوو.
تف لە تەمەڵ و بەدخوو.

## سەگ

سەگان ئەڵێن حەو حەو حەو
نانمان بەنێ بژین بەو،
ئێمە پاستان ئەکەین شەو
وەختێ چاوتان چووە خەو

سەرچاوە
دیوانی بێکەس، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

## نموونەی نووسینی وتار

# سەرنجدانێ لە(ئەدەبیاتی مەنگوڕی)

ف. بێکەس

ئەوەنەی لە گەلاوێژا بەشی لێکوڵینەوە تەرخان کراوە من زۆر توشی دەردی سەری و ناخۆشی بوم، باوەرم پێبکەن لە ژینی خۆم بێزارم هەروەکو پێشینان وتویانە(دارێکم بەدەستەوەیە هەردوو سەری....) نازانم چی بکەم؟ ئەگەر رەخنەم لە شیعری کەسێ گرت ئەو کەسە لە خۆڕایی لێم ئەبێتە دوشمنیی بە خوێنی سەرم تینوو، چونکە داخەکەم ئێمەش هێشتا لە مانای(ڕەخنە گرتن) نەگەیشتووین، بە جنێوی ئەزانین، ئەگەر قسەش نەکەم و هەر چییەکم دی چاوی لێبنوقێنم و بەسەریا بڕۆم و گوێی نەدەمێ ئەوەش نابێ، چونکە زۆر بەگوناهێکی گەورەی ئەژمێرم ئەگەر ئاوەڵێکم ڕێگا هەڵە بکاریێ نیشان نەدەم نەیخەمە سەرشەقامی ڕاست بەشەرتێ خۆشم شارەزای ئەو ڕێگایە بم، جا لەبەر ئەمە کە باسم کرد سەرم لێ شێواوە زۆر خراپ داماوم نازانم چی بکەم؟! لەگەڵ ئەوەشدا من گوێی نادەمە هیچ کەس وەلەڕەخنەگرتن هەتا پێمبکرێ دەسهەڵناگرم، چونکە بە پێویستی ئەزانم لەسەر شانی خۆم بۆ بەرزکردنەوەی ئەدەبیاتی کوردی هەتا لەتوانامابێ هەوڵبدەم و درێغی نەکەم، خۆیجگار لەم ڕۆژانەدا خوابێ چاوینیان بکا ئەوەندە(شاعری تازە کوورە) پەیدا بووە لە ژمارەنایە، پیاو نازانێ لە کامیان بکوڵێتەوە، جاری با (ئەدەبیاتی مەنگوڕی) تان بخەمە پێشچاو سەرنجی بدەنێ بزانن چۆنە بۆ ئەوانەی تریش خوایاربێ هەرچییەکمان لەدەس بێ درێغی ناکەین ئەمجا تکاتان لێ ئەکەم گەلاوێژی ژمارە(٥) ساڵی (٥) بگرن بەدەسەوە و تەماشای لاپەڕە(٤٢)ی بکەن

لە رباعی یەکەمدا مەنگوڕی ئەفەرموێ:-

**ئەگەر لەسەرتە مەیلی چاو ئەنداز**
**ئاگات لە خۆبێ لە ژنی زۆر جامباز**
**ئەوەی بە غەمزەو غەرام ئەتدوێنێ**
**لەچنگ هەزاران خۆی کردوە دەرباز**

جارێ لە پێش ئەوەی کە بۆ معنا بگەڕێین، چونکە(المعنى فی بطن الشاعر) دێینە سەرکێشانی بۆمان دەرئەکەوێ کە مصرعی دووەم و چوارەم لەنگن، ئەبوایە بێ فەرموایە(ئاگات لە خۆبێ لە ژنی جامباز) و وشەی(زۆر) لێرەدا زیادەوە لە مصرعی چوارەمدا بیفەرموایە(ئەگەر دروست بێ) لە چنگ هەزاران خۆی کردوە دەرباز)

لێرەشدا حرفی(و) زیادە خۆ ئەگەر ماناشت ئەوێ نەمن، نەتۆ خۆی تێناگا چی فەرموە.

تەماشای رباعی دووەم بکەن ئەمەیە:-

**ئەوەی گەرەکیە خاکی کا پیرۆز**
**نابێ گوێی باتە ناڵەی جگەر سۆز**
**باغی استقلال بەبێ خوێن ناڕوێ**
**برات بێ خائن بیکە فدای هۆز**

لەم رباعیەدا کەم و کوڕی تیا نیە لە کێشانا، بەڵام داخەکەم لەلایەن ماناوە نەیتوانیوە باش دەرییبخا ئەبوایە مصرعی دووەمی ئەم رباعیە وابوایە(بەبێ گوێی دانە ناڵەی جگەر سۆز) وە لە مصرعی چوارەمدا ئەگەر وابێ جوانتر نییە؟ (برات خائن بی بیکە فدای هۆز).

روباعی سێیەم بە هەزار حاڵ و نالی عەلی پیاو ئەتوانێ معنایەکی بۆ بدۆزێتەوەو و لەنگیش نییە بەڵام ئەگەر لە مصرعی دووەما بیووتایە(ژیانت تامین بکە ئەی دڵسۆز) گەلێ جوانتربوو.

رباعی چوارەم ئەمەیە:

**ئەوەی کە ئەتکا محبوب لەناو هۆز**
**ژیانی پاکەو ئاشنایی دڵسۆز**
**(دە) دوستی یەیکرەنگ لە خۆشی تالی**
**ئەتوانی تێکدا اوردووگای ئاڵۆز**

لە کێشا لەنگ نییە، بەڵام بە خوێندنەوەی مصرعی ئەوەل شعری شاعیرێکم دیتەوە بیرکە تازە فێری کوردی بوبو...

ووتویەتی(ئەمن لە تفتیش هات لە کوردستان) ئیحتیاج ناکا ئەویتر بنووسین. خۆ مصرعی چوارەمیش هیچ معنایەکی تیا نابینم، چونکە(اوردووگای ئاڵۆز) بە معنای اوردووگایەکە لە خویا پشیوو تێکچووبێ، ئیتر لە تێکدانیا چە هونەرێکی تێدایە؟

ئەمەش روباعی پێنجەمە:-

**وەك مۆرەی شەترەنج ناگری ئاسایش**
**ئەو پیاوەی خۆی کرد بەدرو ئارایش**
**چونکە هەر وەزعێ کە تولێ بدوێ**
**ئەبێ مەوزوعت بۆ بکا با جاریش**

دەستم داوێنت کاکەی مەنگوری لەم رباعیەدا چە نیازو مەبەستێکت هەیە، تووبی خوا ئەگەر بۆمان دەرنەخەی، جاری لە یاری شەترەنجا مورە نیە، وە مورەش ئاسایشی هەیە ئەبێ هەر بەلایە کا بکەوێ سایا لەسەر یەك، یا لەسەر دوو ئیتر بۆچی ئاسایش نییە؟ جگە لەوەش ئەگەر لێم ببوری ئەتوانم بڵێم ئەم رباعیە هیچ معنایەکی تیا نییەو کەس تێی ناگا. وا ئەمجارە(ئەدەبیاتی مەنگوڕی)مان خستە پێش چاوی خوێندەواران مەبەستیشمان تەنها ئیصلاح و ڕێگا نیشاندانە هیچ ئامانجێکی ترمان نییە، هیوامان هەیە بتوانین لەم ئەرکەدا کە گرتوومانەتە ئەستۆی خۆمان کەم و زۆر خزمەتێکی شعرو ئەدەبیاتی کوردی بەجێ بهێنین وە هەروەکو لە پێشەوە ووتونانە گوێی نادەینە توانج و پلاریکەس، خەڵکی چی ئەڵێ بیڵێ دەس لە دەس و قوەت لە خوا.

# أ. ب. هەوری لەناو تەرازووی شیعرا

نووسینی-فایەق بیکەس-

ئەم گۆڤاری گەلاوێژە کە ئەستێرەیەکی بەشەوق و پرشنگدارە لە ئاسمانی ئەدەبیاتی کوردا، داخەکەم جارجار هەندێ شتی ناشرینی تیا ئەبینرێ کە ئەبێتە پەڵە هەوربەری ڕووناکی و درەوشانەوەی ئەو ئەستێرەیە ئەگرێ، ئەو دیمەنە جوانە دڵدارە لەچاو ئەشارێتەوە کە بەمەش لە جیاتی ئەوەی خۆشی ببەخشێ بە پێچەوانەی ئەوە دڵی خوێندەواران تەنگ ئەکا.

لێرەدا نازانین گلەبی لە کێ بکەین؟ لەو کەسانەی کەشتی وابێ تام و ناپوختە ئەنێرن بۆ ئەم گۆڤارە نازدارە یالەو کەسەی بکەین کە سەرپەرشتی گەلاوێژی گرتۆتە دەست؟ ئەگەر چی گەلێ لە خوێندەوارەکان لایان وایە کە ئوباڵی ئەم کەم و کوڕیە لەسەر شانی ئەو کەسەیە کە سەرپەرشتی گەلاوێژ ئەکا، بەڵام من لام وایە ئەمە ڕەوای هەقنیە، چونکە لە گەلاوێژا بەشێك تەرخان کراوە بۆڵێ کۆڵینەوە کە هەموو کەسێ هەقی هەیە بە شێوەیەکی ئەدەبی جوان کە لە سنوری نزاکت دەرنەچێ چە لە شیعرەوە چە لەووتار بکوڵێتەوە وەلێی بدوێ.

بەم بۆنەیەوە ئێمەش وا ئەمە ئەنوسین ئەمجارە لە ژمارەی(١) ساڵی(٥) لە دیوانی گەلاوێژدا لە ژێر عنوانی"پەیڕەوی خیام"دا چاومان بە چەند رباعییەك کەوت لە لایەن أ. ب هەورییەوە ڕێکخرابوو، نەك من بە تەنیا هەرچی خوێندەواران هەیە هەموو لەم شیعرانە بێزارو وەرس بون وەزبانی حاڵی هەموومان بە جارێ ئەڵێت(خیام گۆڕ هەڵتەکینە أ. ب هەوری وەها پەیڕەوت ئەکا) ئینجا سەرنج بدەنە رباعیەکانی أ. ب هەوری بزانن ئەڵێ چی لەیەکەم رباعیا ئەفەرموێ. **(من کەبێ پرس بێمە دنیاوە/ هەر بە ناچاریش بچمەوە دواوە/ کوێم مەیل بینی رو لەوێ ئەکەم/ چم لە سەگ وەرو لە بەنگ و باوە)**

جارێ لە پێش ئەمەدا کە بۆ معنای ئەم رباعیە بگەڕێین ئەگەر ماموستا أ. ب هەوری لیمان ببورێ ئەیخەینە تەرازووی شعرەوە، لە پاش کێشانی بۆمان دەرئەکەوێ کە مصرعی یەکەمی لەنگە، ئەبوایە وابوایە(من کە بەبێ پرس.... هتد)، خۆ ئەگەر بۆ مەعناش بگەڕێین ئەوە هیچ، چونکە ئەڵێت.( کوێم مەیل بینی ڕولەوێ ئەکەم) ئەمە ڕاست نییە، گریمان ماموستا أ. ب هەوری ئارەزووی فەرمو بچێتە لەندەن، پاریس، ئەمریکا، چۆن ئەتوانێ؟ وە بەچیئەچێ، چونکە نەپارەو نەتوانای ئەوەی هەیە کە ئەو ئارەزووەی بەجێبهێنێ کەوابو ئەم قسەیە ڕاست نیە، جگە لەوە مصرعی چوارەمی کە ئەڵێ(چیمە لە سەگوەڕ لە بەنگ و باوە) زەوقێکی ئەدەبی تیا نیە چونکە ئەبێ موسیقایەك بێ عاتیفەی ئینسان بزوێنێ وە مەست و شادی بکا، نەك بە(سەگ وەڕ) گرژوو زنجیرەی بکات، سەرەرای ئەمە(بەنگ و باو) نیە(بەنو باو)ە بێینە سەر روباعی دووەم تەماشاکەن چی ئەفەرموێ: **چۆنم هێناوە وای ئەبەمە سەر/ بەندەی کەسێکم ڕاست و هونەروەر/ قسەی نەزان و پیاوی ریاکار/ لای من گەفینە یا زەڕینی کەر** تکاتان لێ ئەکەم خوێنەرە بەڕێزەکان لەم رباعیەدا چەند عەیبێکی فەلسەفی تێدایە کە لە بیری خیام بچێ؟ ئایا(گەفینی سەگ و زەڕینی کەر) کە هاوتای بیری قوڵ و ووردی خیام بکات؟ من نازانم أ. ب هەوری ڕقی لە خیام هەستاوە کە خەریکە بەم ڕەنگە ئابڕوی بەرێ باله گەلاوێژ یا لە خۆی؟ باله رباعی سێیەم ووردبینەوە کە ئەڵێت:

**کەلاوە کۆنێ کە دەنیای ناوە — چۆن دڵی پێ خوشکەم مشتێ کاو ئاوە**
**کەیو مورزو داراو سکەندەر — هاتن و روین کەچی ئەو ماوە**

لێرەشدا ئەگەر باش سەرنج بدەین ئەبینین مصرعی دووەم لەنگە، وە لەلایەن مەعناشەوە زۆر بێ مەعنایە چونکە کاو ئاو هیچی لێ پەیدا نابێ یەکناگرن وە دنیاش عیبارەتە لە گڵ و ئاو نەك کاو ئاو.

لە رباعی چوارەمدا ئەڵێت:

**ئەوی بۆ کورسی خەڵك ئەرەنجینی — خونچەی شادمانی هەل ئەوەرێنێ**
**گا، بوایە بەخوا زۆر چاتر بو — کەژو کێو زۆرە زك بلەوڕێنی**

لێرەشدا لە پێش هەموو شتێکا دیارە کە مصرعی سێیەم و چوارەم لەنگن جگەلەوەش قسەیەکی منتیقی لەم رباعیەدا نابینرێ توخوا ئەی خوێندەواران تکاتان لێ ئەکەم کێ بۆ کورسی خلق نارەنجێنێ وە ئەوە تەتی دنیا دنیایە ئەم هەموو شەرو هەرایە کە رووئەدا هەمووی لەسەر کورسیە یانە؟ بەڵێ بێ گومان ئەتوانن بڵێن کە ئەم هەوڵ و تەقەلایەی کە ئەدرێ بۆ کورسی غەریزەیەکی تەبیعیە لە ئینساندا بۆ ئەوەی سەری خوێندەواران زیاتر نەیەشێنین واز لە رباعی پێنجەم ئەهێنین خۆیان چۆنی لیك ئەدەنەوە لێکی بدەنەوە، وە بە تایبەتی تکا لە ماموستا أ. ب هەوری ئەکەم لەم قسانەم دڵگیرنەبێ چونکە ئەمە خزمەتێکی ئەدەبییە لەسەر هەموو ئەدیبێکی دڵسۆز پێویستە لەم ڕووەوە دریغی نەکات. وە دوبارە تکات لێ ئەکەمەوە لە پێش ئەوەدا کەشت بنێری بۆ گەلاوێژ جوان سەیری بکە وەباش سەرنج لە وەزن و معنای بدە، وە پوختی بکە ئەوسا بینێرە، چونکە گەلاوێژ حەیفە بە ناشرینی بکەوێتە بەر چاوی دۆست و دوژمن، ئیتر خوا یاریدەری هەمولایەکبێ.

# وەرام بۆ ف. بێکەس

أ. ب هەوری

مامۆستا ف. بێکەس لە ژمارە(٢)ی ساڵی(٥)ی گەلاوێژا ڕەخنەتان لەو شیعرانە گرتبو کە ئێمە لە ژێر عنوانی"پەیڕەوی خیام"دا بڵاومان کردبوەوە، ئەمە وەرامەکەتانە.

١. جاری ڕەخنەتان لە عنوانی شعرەکان گرتبوو، وا لەبەر ئێوە وەرامەکەتان ئەدەمەوە ئەگینە شتی وای تێدانییە: هەموو کەس ئەزانێ یەکێ کە ناولە شتێك ئەنێ لەسەر ئیجتهاد و ئارەزوی خۆیەتی بە تەواوی بۆ ئەوە نییە ئیسم و میسمی متابق بێ مسلا پیاوێك کوڕەکەی ناوئەنێ(صلاح الدین) کەچی ئەوکوڕە ئەبێ بە جوتیار، ئەمە چە گوناهێکی باوکی تێدایە کە نەبوو بە صلاح الدینی مەشهور، من کە ناوی خیامم هێناوە هاوبیری خیامم ئەگەر وابوایە ئەبو هەمیشە لە مەیخانەدا بوومایە، وەك مفکورەی ئێمە ئەفەرموێ ئەبێ"هەرکە سەرێشی سوربێ حمزە ئاغابێ" لە ئەمریکادا بە هەزاران(روزفلت) ناو هەیە ئەی بۆچ هەموو ڕەئیسی جمهوری نین؟ بێجگە لەمەش قاعدەیەك هەیە(کل) بەناوی(جو)وە ناو ئەبرێ لەو رباعیەکانی خیام، بۆیە هەمو شعرەکان بەو ناوە ناو براوە.

٢. من لە پێش ئەوەدا ئەو شعرانە بنێرم بۆ گەلاوێژ لە پێش ئەوەشدا ئێوە بڵێن، نیشانی چەند کەسێکم دابوو بە پێچەوانەی ئێوە ئەوان بەلایانەوە چاك بوو، ئەوەتان بۆنەچوەسەرکەووتبوتان"نەك من بە تەنیا هەرچی خوێندەواران هەیە هەموو لەو شعرانە بێزارو وەرسبوون" ئەمێنێتەوە سەر ئێوە و هاوبیرەکانت بە تەنها ئەوەندە وەکاڵەتێکی عام قبوڵ ناکرێت.

٣. ڕەخنەت لە شعرەکانە کە نەزاکەتیان کەم تیایە کەچی ڕەخنەکەت درۆنیش نەزاکەتی تیا نادۆزێتەوە، بێجگەلەمەش ئەم ڕەخنەیەت ڕاستەوخۆ بۆ زمانی کوردییە، چونکە زمانەکەمان بێ پێچ و پەنایە بە سەربەستی شت ئەڵێت، بۆ ئیسپاتی ئەمەش وا چەن قسەیەکی پێشینان ئەنوسین کە وەختی خۆی لە ژیان و گەلاوێژیشدا نوسراون وە لە نەزاکەتدا هەروەك هینەکانی من وان، جا نازانم بۆچ ئەو حەلە ئەم ڕەخنەیەت نەگرت وە نەتفەرموو ئەم قسەوپەندی پێشینانە نەزاکەتیان تیا نییە وازیان لێ بێن نبا لەبیر بچنەوە:

"نان بدە بەسەگ مەیدە بە سپڵە" لێرەدا سە گ تەرجیح دراوە بەسەر سپڵەدا.

"دار هەڵبرە سەگی دز دیارە" ئەمەش هەر مەبەس ئینسانە

"هەمزە لە هەباسی چی... لە تەوراست چی"... ئەمانە قسەی پێشینانە بەرەکەتدا زۆرکەس ئەیزانن، ڕێی ئەوەت نییە بڵێیت توخوا خوێندەوارینە کەی ئەمانە کوردین، چونکە لای تۆوایە"ئەوی تۆ مانای نەزانی کوردی نین" وە یان بڵێت لەهەر پیرەژنێکم پرسی پێکەنی، بۆچی؟ پیرەژن قاموسی ژیانی کوردین؟ علاوەی ئەمانەش زۆر گفتوگۆی وامان هەیە ئەمرۆ لەم شێوەیەدان، مسلا کە ووترا"بەخوا زوڵە" یەعنی بەخوا زیرەکە من بڵێم چی ئێوە بەزمانی خۆتان ڕازی نابن وەشێوەی گفتوگۆی کوردیتان پێ عەیبە، ئەو بێگانەیەی گەلاوێژ ئەخوێنێتەوە عیبی لێ ئەگرێت ئاگای لە گفتوگۆ کانیشمانە.

ئینجا بێنەوە سەروکاری ڕەخنەکانت لە رباعییەکان.

بۆ رباعی یەکەم بێ دەلیل فەرموتە مصرعی یەکەمی لەنگە ئەگەر دەلیلتان بدایە منیش بە دەلیلەوە وەرامم ئەدایتەوە بەلاَم وەك تۆ هەر ئەڵێم لەنگ نییە.

دوای ئەوە مەعنای"کوێم مەیل بینی روو لەوێ ئەکەم" مادام جێگەو هەدەف معلوم نییە تۆ ناتوانی بە باری موستەحیلات و خراپەدا معنای لێك بدەیتەوە، تۆ هەر وەکیلی هاوبیرەکانی خۆتی وەکیلی من نیت.

بۆ وەرامی ڕەخنەی رباعی دووەم ئێستەش ئەڵێم دەنگی جوانێکی بەسەزمان کەهەموو ژیانی لە ڕێی خزمەتی ئینسانیەتدا سەرف ئەکات خۆشترە لەلام لە دەنگی ئینسانی درۆزنی ڕیاکاری بەدنمەکی سپڵە بۆ ئینسانیەت.

لە رباعی سێیەمدا ڕەخنەت ئەوەیە دنیا گڵ و ئاوە، کاو ئاو نییە، من ئەڵێم ئەو رباعیە بۆ خوێندەوارێك کە ئەزانێ(مشبەو مشبەبە) زۆرجار یەکێکیان ناو نابرێ بە قرینە ئەویتریان ئەزانرێ وە هەروەها ئەو شتانەش کە لازمو ملزم بن زۆر جار هەموویان ناو نابرێن، کە یەکێکیان ووترا خوێندەوار لە خۆیەوە ئەویتریان ئەزانێ، بو قوڕ، کا، گڵ، لازمن کە دوانیان مەوجود بون سێیەم ناوبردنی هیچ مانای نییە، توخوا کێ هەیە بێ بڵێت ئەوە کا، ئەوە ئاو، هەندێ قوڕ بگرەوە نەزانێ گڵیش لازمە؟! بێجگە لە مصرعی پێشو لە شعرەکەدا"کەلاوە" هەیە کە قوڕ لە لوازماتیەتی وەك ووتمان کا، ئاو، گڵیش لوازمی قوڕن، عەلاوەی ئەمانەش مەجال جائزە بۆ تصرف لەبەر قافیە.

بۆ کورسی خەڵك ڕەنجا بن: مەبەس ئەوەیە یەکێ لە ڕێگەیەکی غەیرو مەشروع بۆ بەرزی خۆی هەوڵبدات، یا لە ڕێی گەیشتن بەو بەرزییەی وا هەزاران کەم دەس و هەژار لەناو بچێت و حقوقیان بکرێت بە ژێر پێوە کە ئەمەش تەماعکاری پێئەڵێن و حەقێکی مەزمومە، مەبەس ئەوە نییە بە تەریقەیەکی مەشروعی هەوڵبدات کە بە عەرەبی(طموح)ی پێ ئەڵێن و شتێکی جوانە کەوابو تۆ بە پێچەوانە ئەمەشتان وەرگرتوە.

مامۆستا ف. بێکەس وا وەرامی ڕەخنەکانم دایتەوە تکام وایە لێم ببوری وەك من لە تۆ بوردم.

# پێشکەش مامۆستا أ. با هەوری

ف. بیکەس

مەبەس لە ڕەخنەگرتن لە شعرو ئەدەبیات ئیسلاح و ڕێگا نیشاندانە نەك شەرە قسە، بە وەلأمەکەی گەلاوێژ ژمارە(٤) سالّی (٥) تانا وا دەرکەوت کە دلّگیربون منیش وام بە ئێوەدا رانەئەپەرمو کە ئەوەندە کەم چیکلدانەبن ئامۆژگاریەکانم بە خراپ تێبگەن، ئایا نەت بیستوە کە پێشینان وتویانە(دۆستم ئەوەیە کەئەمگریینیٚ) جا بابێینەوە سەرەوکاری وەلأمەکەت.

من خوانەخواستە چۆن بەتۆ ئەلّێم خۆت ناو ناوە(عومر خەیام) مەبەسی من ئەوەبوو کە کەسیٚ پەیڕەوی کەسێکی کرد ئەبیٚ یا شان بەشانی ئەوکەسە بروا بەڕێدا یا هیچ نەبیٚ نەختیٚ لەوبچیٚ، خۆ بە ناشوکری نەبیٚ شعرەکانی ئێوە هیچ فرێکی بە سەر شیوەو بیرو ئسلوبی خیامەوە نییە، تکات لێئەکەم پێم بلّێکام رباعی لە رباعیەکانت لە هی خیام ئەچیٚ؟ وە ئەو کەسانە کێن نشانت داون کە خۆت وتوتە؟ ئایا نیشانی(زێوەر، بێخود، پیرەمێرد، سەلام، شێخ نوری)ت داوە؟ ئەگەر ڕاست ئەفەرموی پێم بلّیٚ وەکو من بزانم تەنها بۆسیٚ چوار کەسێکی نەشارەزات خوێندوتەوە کە بە(باشە)ی ئەوان دەس خەڕۆبویت و لە گەلاوێژ بلأوت کردوتەوە. بۆ ئەمەی زۆر درێژەی پێنەدەین ئەم داوایەمان کە عبارەتە لە چکی رباعیەکانت کەلە گەلاوێژی ژمارە (٢) سالّی(٥)دا نوسراوە حوالەی وجدانی شاعر و ئەدیبانی کوردی ئەکەینوە بە پەرۆشەوە تکایان لێئەکەین کە بیرو باوەری خۆیانمان لەلایەن ئەو روباعیانەوە لە گەلاوێژا بۆبنوسن کە بە تەواوی پیٚ لە ناتەواوی شعرەکانی خۆت بنێی وە جارێکی تر توشی هەلّەی وا نەبیت.

جەنابی مامۆستا أ. ب هەوری ڕەخنەکەی من وەکو فەرموتانە بۆ ژیانی کورد نییە تەنها شعرەکانی تۆیە کە ڕەونەق و نرخی ژیانی کوردی شکاندوە وە هەرکەس بیخوێنێتەوە بە هۆی ئەوەوە(نەفرین) لە هەمو شعرێکی کوردی ئەکا، ڕەنگە ئێوە وا بزانن کە شعرەکانتان نمونەی بەلاغەت و فەساحەتی ژیانی کوردییە وەهەر کەسیٚ ڕەخنەی لیٚ بگریٚ وەکو ڕەخنەی لە ژیانی کورد گرتبیٚ وایە ئەگینا کەی من ڕەخنەم لە ژیانی کورد گرتوە، وە چۆنا من قسەو پەندی پێشینان بە ناشرین ئەژمێرم؟ چونکە هەر کەسە نەختیٚ تێگەیشتبیٚ ئەزانیٚ ئەوانە هەموو نایابن وە لە جێگای خۆیا بەکارهێنراون. تێناگەم ئەمە چەدەخلێکی هەیە بەسەر رباعیەکانی تۆوە راست بۆ ئەمەبوو(هەمزە لە هەباست چی.......... لە تەور داست چی)

کاکە أ. ب هەوری

نازانم جەنابت چە نەوعە دەلیلێکت ئەویٚ کە نیشانت بدەم و لەنگی ئەم مصرعە(من کە بیٚ پرس بێمە دنیاوە)، ئەگەر نەختیٚ زەوقی ئەدیبیت بیٚ ئەبوایە بتزانیایە کە لەنگە، جگەلەوەش رباعیەکانی تۆ کەلەسەر ئاهەنگی(مستفعلاتن مستعفلاتن)ە، فەرموو ئەم مصرعەی پیٚ بکێشەوەبزانە چۆنەوە ئەگەر باوەر بەوەش ناکەی هەروەکو لە پێشەوە عەرزم کردی لەنگی و کەم و کوری و بیٚ مانایی رباعیەکانم حوالەی رای شاعرو ئەدیبەکانی کورد کردوە ئەوان وەلأممان ئەدەنەوە.

جەنابت ئەفەرموی کەمن(دەنگی حەیوانێکی بەسەزمان کە هەموو ژیانی لە خزمەتی ئینسانیەت سەرف کات خۆشترە لەلام لە دەنگی ئنسانی دروزەنی ڕیاکاری بەدنمەکای سپلەی مضر بۆ ئینسانیەت) کەچی بە پێچەوانەی ئەوە لە رباعیەکەتا ئەلّێی:

(قسەی نەزان و پیاوی ڕیاکار لای من گەفینە یا زەرینی کەر)

لەم رباعیەدا وادیارە کەتۆ تەنەفورئەکەی لە گەفیتی سەگ و زەرینی کەر، چونکە وەکو قسەی نە زان و پیاوی ریاکار وایە کەچی لەلایەکی تریشەوە لەوەلأمەکەتا خراپ، ئەمە چی بەسەرچییەوەیە؟ هەر خۆت خۆتت ڕەدکردەوە ئێمە کە منالّ بوین لە مەکتەبا خوێندومانە ئەرز دووبەشە(١) ئاو(٢) گلّ (وشکایی)، نەمان بیستوە کەسیٚ بەشە ئاو، گلّ ، کا، ئافەرین مامۆستا أ. ب هەوری بۆ خۆت و نزەریەی تازەت کەوا ئینقلابت دابە علمی جغرافیا. ئەمەش ئەخەینە پێش چاوی مامۆستایان و زانایان بزانن ئەوان چی ئەفەرموون.

مامۆستا أ. ب هەوری، وابزانم بەم قسانە نەختیٚ سەرمان یەشانی لێمان ببورە، تکا ئەکەم ئەمجارەش وەکو جاری پێشو قسەکانم بە خراپ وەرنەگرن.

**نموونەی وەرگێڕان**

# دوو کوژراو لە پێناوی شەودا



فایەق بێکەس

لە عەرەبییەوە کردوویەتی بە کوردی

دوێنێ شەو بە درێژایی شەو خەوم لێنەکەوت چونکە لەهەر چاولێك نانێکما ناڵەیەکی پرئێش کە لە دەروونی ژنێکی کەساس وبێدەرەتان کەوا بەدەم ئێشێکی زۆرەوە بتلێتەوە ئەهاتە دەرێ ڕای ئەپەڕاندم، بەیانی زوو کە ڕۆژبووەوە چوومە ئەو ماڵەی کەوا بە تەنیشتمانەوە بوو وە ئەو دەنگەی لێئەهاتە دەرێ کە ڕوانیم ژوورێکی تاریکی بچووکی تیایە وە لەو ژوورەشا تەنها جێگایەکی هەژارانە داخرابوو، ژنێکی نەخۆشی ڕەنگ زەردی لەسەر راکشابوو. بە هیواشی چوومە پێشەوە بەلاّم ئەو هەستی منیکردو چوومە لایەوە گوێم لە نوزەیەکبوو وتی(ئاو) هەرچۆنێکبوو چۆرێك ئاوم بۆ پەیدا کراو کردم بە دەمیا باش بوو بەوە نەختێك دەمیهاتە گۆ، پێم وت: چیت لێقەوماوە زوو پێم بڵێ؟!

بە دەنگێکی هێواشی پچڕپچڕ وەکو لە گیانەلاّ وابێ: باوکم دامی بە شوو بەپیاوێکی لە ژن بێزار، ژن زۆرهێنەر، ئاخێکی هەڵکێشاو وتی ئاخ، لە کچبە شوودانا خۆزگە پرسیارێکیان بە کچە ئەکرد، من ئەگەر ئەمەم ئەزانی لە پێش ئەوەدا کە بە زۆرە ملێ باوکو برا بمدەن بەم پیاوە هەر شووم نەئەکرد تەرکی دنیام ئەکرد و ئەبووم بە راهبە. بەلاّم چیبکەم ناچاربووم پەسەندمکرد. لە ئەوەڵ ڕۆژدا هات بە پیرمەوە وەکو مێردێکی دڵسۆز و لەگەڵما زۆر ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین بوو، هەر بەو ڕووخوشی و پێکەنینەش لە دواییدا تۆقاندمی، تەراندمی. وەکو چۆن شێربە پێکەنین نێچیرەکەی ئەتۆقێنێ ئیتر زۆری پێنەچوو وام لێ هات هەر چاوەڕێی ئەوەم ئەکردکەی جیابێتەوە؟ ئەوەندە درێژەی نەکێشا ئەو ژنێکی تری هێناو منی لەبیرچوەوە. منیش لەگەڵ کچە بچکۆلەکەما بێکەس و هەناسە سارد مامەوە. بەلاّم ناچار شانم دایە بەر ئەم خەم و خەفەت و کوێرەوەریە چونکە هەرچەند سەرم ئەبردو سەرم ئەهێنا شتێکی وام نەدۆزیەوە کە خۆمی پێ ڕزگار بکەم ئەوەندنەبێ کچەکەم هەڵگرت و چوومەوە ماڵی باوکم لەوێش کە ڕوانیم باوکیشم کەوتووە بەدەم دەردەوە ئەتلێتەوە خۆ کە چاویشی بە من کەوت ئەوەندەی تر دەردی گرانبوو، هەروا دوو ڕۆژی بەسەرا نەڕۆی کۆچی دوایی کرد. ئینجا زانیم لە ئەزەلدا فەلەك چەند ڕۆژێکی تاریکو ناخۆشی لە چارەم



نووسیوە، بەڵام نازانم کەی ئەبڕێتەوە، چی تریشم بەسەردێ، بەم ڕەنگە کەساس و بێ دەرەتان مامەوە ناچار هانام بردەبەر یاوکی کچەکەم کە هیچ نەبێ لەبەر خاتری کچەکەی بمانژیەنێ و هۆمان نەخاتە بەر بێگانە بەڵام بێسوود بوو گوێی لێنەگرتم.

بەزۆر دەستم کرد بە گۆرەوی چنین تا بتوانم ئەو کچە بچکۆلەیە بەخێو بکەم بەڵام تەماشام کرد ئەویش بێکەڵکە ئینجا دەستم کرد بەشت فرۆشتن تاوام لێهات لەم دەستە نوێنە شڕە زیاتر هیچ شك نابەم. لەبەرئەوەی ناچاربووم مانگێك لەمەوپێش کاغەزێکم بۆ مێردەکەم نووسی ئەم حاڵەی خۆمانم تێگەیاند زۆر لێی پارامەوە کە ڕزگارمان کا والەو ڕۆژەوە چاوم ڕوا هەر چاوەڕێی ڕەشاییەکم کەلەسەر ئاوەکەوە دەربکەوێ. شەوێك لەم شەوانەدا لەم ژوورە تاریکەدا دانیشتبووم کچەکەم لە باوەشا بوو سەیری ڕووی ڕووناکی ئەو کچە نازدارەم ئەکرد وەکو پاپوڕەوانێك لە شەوێکی تاریکا سەیری ئەستێرەی قوتب بکا ئەوەندەم نەزانی لەپڕ ئەوزۆردارە، ئەو بێ ڕەحمە، ئەو خوانەناسە کردی بە ژووراو پەلاماری دام و کچەکەی لە دست فڕاندم و ڕۆیی منیش بێ کەس و بێ دەسەڵات هەناسە سارد لە گریان و هەناسە هەڵکێشان بەولاوە هیچم پێنەکرا بەڵام ئەویش بێکەڵك بوو چونکە نەکەسێك بەزەیی بە فرمێسکەکانما بێتەوەو نەیەکێك هەبوو گوێ لە هاوارم بگرێ.

ئینجا بۆم ئاشکرابوو کە فەلەك بەو تیرەی کە بۆی دانابووم و چەند ڕۆژێك بوو خەریك بوو تێم بگرێ ئەنگاوتمی هەرچۆنێك بوو ئەو شەوەو نزیکەی بیست شەویکەشم بەم حاڵەوە ڕۆژکردەوە ئێستاش ئەوەندە هەیە کەلەم تاریکستانەدا چاوم ئەچێتە خەو کچە بچکۆلەکەم دێتە بەرچاو ئەگری، هاوارئەکا، بانگم ئەکا باوکیشی لێی ئەدا، فڕێی ئەدا گوێی ناداتێ منیش خەریکم پەلاماری ئەدەمێ کە ڕزگاری کەم خەبەرم ئەبێتەوە لام وایە کە یا ئێستا یا تاوێکی تر ئەم دنیایە بەجێ دێڵم چونکە وا گیان گەیوەتە سەرسنگم بەڵام ئاخ ئەم دنیایە بەجێدێڵم بێئەوەی کە جارێکی تر چاوم بەو کچە ناسك و نازدارەم بکەوێتەوە. ئەمانەی تەواو نەکردو هەردووچاوی کردەوە خەریکبوو قسەبکا بەڵام نەیتوانی چاوی پڕبوو لە فرمێسك ولێکینایەوە منیش کە چاوم بەم حاڵە کەوت خۆم بۆ ڕانەگیراو دەستم کرد بە گریان.

لەم ساتەدا بەم چاوە فرمێسکاویەوە تارماییەکم بەدی کرد، کە چوومە پێشەوە ڕوانیم پیاوێك وەستاوە کچێکی بچکۆلەی بە باوەشەوەیە زۆر بە سۆزەوە سەیری ئەکا و کچەکەش وەك مردبێ هیچ ناجوڵێتەوە پرسیم تۆ کێی؟! وتی من مێردی ئەو ژنەم، باوکی ئەم کچەم وتم لەپاش ئەم هەموو دەردو کوێرەوەریە کەدات بەم ژ نە و ئەم منداڵەت لێ دوورخستەوە ڕەنگە هاتبی کە لێت ببورێ ووتی ئەوەتەی ئەم کچەم بردوە هەر ئەزریکێنێ و هاوار ئەکاو ئەگری داوای دایکی ئەکاو نەخۆشیش کەوت چەند دکتۆرم بۆ هێنا بێکەڵك بوو وا ئێستا هێناومە بەڵکو لە کۆشی دایکیا چاك بێتەوە بە هێواشی چووە پشتیەوە و کچەکەی خستە باخەڵی دایکەکەیەوە دایکە چاوی کردەوە و سەیرێکی کچەکەی کردو کچەکەش هەروا بانگی یەکتریان کرد. دایکەکەی باوەشیکرد بە کچەکەیاو نای بە سنگیەوە بەڵام هەردوکیان چاویان لێکناو گیانیان سپارد. وادیارە چاوەڕێی یەکتربوون.

چوین ئەو دوو کوژراوەمان ناشت، بەڵێ ئەو دوو کوژراوە کە ئەوپیاوە زۆردارە کوشتنی.

ساڵی هەزارانی وا بە هۆی شووکردنێکی واوە ئەم جۆرە پیاوانە ئەیانکوژن.

سەرچاوە

هەمان سەرچاوەی پێشوو

# خەیاڵ لەگەڵ کردەوەدا

**لە عەرەبییەوە فایەق بێکەس کردویە بە کوردی**

ژنێك لەسەر مێزی نان خواردنی ئێوارە لەگەڵ مێردەکەیا دانیشتبوو زۆر عاجزو هیلاك، مێردەکەی وتی: ئەم ئێوارەیە بۆچی وائەکەی؟ وتی بەدەست ئەم منالأنەمەوە هیلاك بووم بەم ڕۆژگارە دەنگم لەگەڵیان یەت و لێیان ئەدەم بۆ ئەوەی تۆزێ واز لە شەڕەشەق بێنن بەلأم هیچ گوێم لێ ناگرن(بەڕاستی سێ منداڵی زۆر نارەحەتی هەبوو، دوو کوڕ یەکێکیان شەش ساڵ ئەوی تریان پێنج ساڵ لەگەڵ کچێکی چوار ساڵیدا) لەگەڵ ئەوەشا کە دایکەکەیان لە بەیانیەوە تا ئێوارە لێیان تووڕە ئەبوو لێی ئەدان ئەی ترسانن بەلأم ئەوان لە زرمە زلێی خۆیان نەئەکەوتن کەچی کە ئێواران باوکیان ئەهاتەوە کش و مات دائەنیشتن.

ئینجا کە ژنە ئەم سکالأیەی لای مێردەکەی کرد مێردەکەی پێی وت: هەموو خەتای خۆتە تۆلە بەیانیەوە تا ئێوارە لەگەڵیان ئەڵێیت سیوایان بۆتەوە تۆ بگرە مەقالەیەکی تازە لە بابەت تەربییەوە نووسراوە بۆت بخوێنمەوە، دەستیکرد بە خوێندنەوە:

(منداڵ دانەنراوە بۆ دایك و باوك کە بە هەوەسی خۆیان هەڵی سوڕێنن بەلأم منداڵ دانراوە بۆ ئینسانیەت و نیشتمان وە یاخود ئەبێ موڵکی نەفسی خۆی بێت).

لێرەدا سەری هەڵبڕی بە ژنەکەی وت: چاوت لێیە؟ ئێستا ئەم سێ منداڵە نەدراون بەئێمە کە بە هەوەسی خۆمان لەگەڵیان بجوڵێینەوە چونکە هەریەکە شەخسیەتێکی هەیە، ئینجا دەستی کردەوە بە خوێندنەوە: (زۆر جار دایك ئەبێت بەهۆی ئەوە کە منداڵ لە دایك و باوك ببێزرێ چونکە دایك لە قانوونی تەبیعەت سەر دەرناکا هەموو جارێ منداڵەکان حەپس ئەکا لە ژوورەوە نایەڵێ بچنە دەرێ بە هەوەسی خۆیان یاری بکەن و ڕابوێرن وخۆیان بە دوی قانونی تەبیعەتدا بڕۆن!!).

لێرەدا مێردەکەی وتی: گوێت لێیە بەتەبیعەت ئەبێت منداڵ یاری و گاڵتە بکا چونکە بە یاری و تاقیکردنەوەو غەڵەتکردن فێرئەبێ.

دەستی کردەوە بە خوێندنەوە:-

(ئەبێت واز لە منداڵ بهێنرێ کە خۆی هەمو شتێك تاقی بکاتەوە نابێ نەیەڵن یاری بکا چونکە بە یاری کردن توانای خۆی دەرئەخاو پێئەگا، لێرەدا مێردەکەی ویستی ئەمە بۆ ژنەکەی لێکبداتەوە بەلأم کە ڕوانی ژنەکەی خەو ئەیباتەوە پێی وت:- باشبوو بەشی زۆرم بۆ خوێندیەوە خۆشت بەیانی تەواوی بکە. ئیتر لەمەولا لەم منداڵانە تووڕە مەبە و وازیان لێبهێنە بە ئارەزووی خۆیان بجوڵێنەوە چونکو بەوە شەخسیەت پەیدا ئەکەن بۆ بەیانی پاش نیوەڕۆ کە پیاوەکە هاتەوە تەماشای کرد دەرگای باخچەکەلەو دیوەوە بەردو خۆڵی دراوەتە بەر ناکرێتەوە. لەبەرئەوە بە دیوارەکەدا سەرکەوت کە ڕوانی باخچە کە وێران کراوەو بەلوعەکە بردراوەو حەوشەکە بوەتە زۆنگاو



زۆر سەری سوڕما کە دەرگای ژوورەکانی کردەوە ڕوانی هەمووی بەسەریەکا دراوە.

بەیەکجار حەپەسا سەیریکرد نە کەس ئەبینێ و نەدەنگ ئەبیسێ کە چووە پێشەوە کوێی گرت تێگەیی کە ژنەکەی لە ژووری نانخواردندا دەرگاکەی لەسەر داخراوە هەر هاواری منداڵەکانیەتی لێی بکەنەوە. چوە پێشەوە بانگی کردچی قەوماوە پێم بڵێ: وتی: کە بەیانی مەقالەکەم خوێندەوە وتم ئیتر لەمەولا لەسەرئەم نەزەریەیە ئەڕۆم لەبەرئەوە منداڵەکان هەرچییەکیان کرد دەنگم نەکرد باخەکەیان وێرانکرد، ژوورەکانیان دابەسەریەکا، دەرگای ئەم ژوورەشیان لەسەر من داخست. وتی: ئەی کلیلەکە لە کوێیە؟ ژنەکە وتی: ڕەنگە لەگەڵ خۆیان بردبێتیان پیاوەکە بە ڕاکردن چوو بە شوێنیایا کەڕوانی والەسەر کۆڵانەکەدا بە شوێنی ئوتومبێلی ئاوڕشێنەکەوەن هەموو لەشیان تەڕو قوڕاوی بووە. ڕایکێشانەماڵەوە کە ڕوانی کلیلەکە لە گیرفانی گەورەکەدایە، دەریهێنا، پێی وتن: دایکتان بۆچی حەپس کردوە؟ وتیان: ئێمە دز دزێنەمان ئەکرد ئێرەپڕبوو بوو لە دزو پۆلیس لەبەرئەوە کە دایکمان هیچی لێنەیە دەرگامان لەسەر داخست وتی ئەی ئەم ماڵەتان بۆ والێکرد؟ وتیان ئەی دزلە کوێوە ڕاکاو پۆلیس چۆن شوێنی کەوێ؟ ئنجا مێردەکە دەرگاکەی کردەوە و ژنەکەی سەیرێکی مێردەکەی کردو سەیرێکی منداڵەکانیشی کرد مێردەکەی سەری داخست وتی هیچ نالێم، هەقتە، ئەبێت ئەو عالمەی کە ئەم نەزەریەیەی نووسیوە خۆی منداڵی نەبێت خەیاڵ و نەزەریە لە کوێ؟! کردەوە لە کوێ؟!.

سەرچاوە

هەمان سەرچاوەی پێشوو





# شەرەف

بێکەس و بەختیار زێوەر کردویانە بە کوردی

ووشەیەکە گەلێ تیرە لە ئادەمیزاد هاواری پێوەئەکا، بەڵام گەلێکیان لە مانا ڕاستەقینەکەی ئاگادارنین، دەستەیەکیان لایان وایە شەرەف ئەوەتا لە دروست کردنی کۆشك، بڵند کردنەوەی خانو، ڕازاندنەوەی دیوار، ژوری نۆکەری و دەس و پێوەند، پەیاکردنی ئەسپ و سواربوونی گالیسکەیە.

دەستەیەکی تریان لایان وایە شەرەف ئەوەتا لە لەبەرکردنی جلی نایاب و خۆڕازاندنەوە بە خشڵ و زێڕ، کە داڕژابێ بە بەردی وەکو ئەڵماس و یاقوت و زمروت و وینەی ئەمانە، دەستەیەکیان وا دێت بە بیریانا کە شەرەف ئەوەتا لە دەست کەوتنی هەندێ لەقەب وەکو بەگ و پاشا یاخود لەو مەدالیانەدا کە پێی ئەڵێن نیشان و بەو ناوە زل زلانەوە کە هەیانە وەکو یەکەم لە فلان پول، دووەم لە فلان پلە، جا چاوت پێئەکەوێ گەلێ پیاو ماڵی هاوڕێی خۆی تالان ئەکا، یا ماڵی خزم و نەتەوەی یاهی هۆزەکەی و هاوڵاتیەکانی ئەدزێ، بۆئەوەی بەم ماڵە حەرامە کە چنگی کەوتوە کۆشکێك دروست بکا، یا خانویەك بڵند بکاتەوە یا ماڵێك بڕازێنێتەوە کە دەورو پشتی بە نۆکەر وە پاسەوانی بۆ دابنێ لە خزمەتکار، وەواتێ ئەگات بەوە گەورەیی و شانازی پێوەبکا بەسەر هاوڕێکانیا، وەوادێت بە بیریا کە گەیشتوەتە پایەیەك کەس نایگاتێ، خۆی بەم ئەحواڵەی خۆی ئەڵێت(شەرەفدار) وەلایوایە گەیشتۆتە مانا ڕاستیەکەی. هەندێکی تریش هەیە شەونخونی ئەکێشێ و ڕۆژگار ئەبڕێت بۆ دۆزینەوەی هۆیەك بۆ ئەوەی لقێك لەو لقانەی دەسبکەوێ، یا مەدالیایەکی چنگ بکەوێ، یا بەرگێکی ڕەنگا وڕەنگ، ئیتر ئەو هۆیانەی هەمو بەلاوە پەسەندە هەرچییەك ئەبێ ببێ، بانیشتمانەکەشی پێوێران بێ، یا هۆزەکەی پێزەبوون ببێ، یا هاووڵاتیەکانی پێ پارچە پارچە ببێ، لای وایە ئیتر گەیشتۆتە(هەرە چڵی بەرزی شەرەف).

ئێمە ئەبینین ئەم خەیاڵاتانە هەموی لەجێی ڕاستی جێگیرەبووە لە مێشکی گەلێ کەسدا بەڵام لامان وایە چاوی ڕاستی کوێرنەبوە لە عاستیان، ئەوان خۆیان کوێر کردووە بۆبەجێ هێنانی ئامانجیان و لەڕێی ڕاستی لایانداوە.

چی پێئەگات و بەچی ئەبێ ئەوەی شانازی بە کۆشك و نۆکەرو کارەکەرەکانیەوە ئەکا؟ ئایا پێ نازانێ ئەگەربێت و زیاتریش لەوەی چنگ بکەوێ کەبە بیریا دێت خۆی هیچ سودێکی لە کەمال وەرنەگرتووە، وە ئەوهەموو شتانە کە پەیای کردووە بە خویش و بێگانەوە دورە لێی وە هیچی پێ نابڕێت لەو دەردەسەریە زیاتر کەبۆی کێشاوە، ئایا نابینێ ئەوانەی گەیشتونە ئەو پایەو بڵندتربونەوە، چەپگەرد هەموی لە چنگ دەرهێناون، هەر ئەوەیان بۆ ماوەتەوە بەو خوڕەوشت و سەروسیمایەوە کە بویان، ئەگەر لە کەماڵی ئینسانی بێ بەهرەبوبن چونەتە ڕیزی دەستەی بێ ڕێزەوە لە هیچ دڵو دەرونێکا جێگایان نەماوەتەوە.

چی پێ ئەبرێ ئەوکەسەی شانازی بەخشڵ و جلەکەیەوە ئەکات، ئەگەر ئەوانەی لەبەر دابکەندیت و بەروتی بمێنێتەوە ئەگەر خۆی خاوەنی کردەوەی بەرزی بەنرخ و خاوەنی جوانی پێگەیشتن نەبێ، ئاخۆ سواڵکەرە روت و قوتەکان لە ڕیزیەکانین؟. ئایا پێ نازانێ ئەو کەسەی دڵخۆشی خۆی ئەداتەوە بەخۆهەڵکێشان، هەمیشە لەگەڵ تیاترۆ ئافرەتی خراپا لە کوڕێکا دێن ودەچن؟ چی پێ ئەبڕێت ئەوەی بە ڕوتبەکەی ئەنازێ و بەمەدالیاکەی بایی بووە، ئەگەر لە پێش ئەوەدا بگاتە ئەو مەدالیایەوە بڵندبێتەوە بۆ ئەو ڕوتبەیە لەسەر ئەحواڵێك نەبووبێ بە، گەورە زانرابێ، یا پێ گەیشتنێکی نەبوبێ بە گەورە ژمێررابێ، ڕەنگە لێی دابکەنرێت ئەچێتەوە دۆخی رسوایی جارانی؟ گریمان بەو لەقەب و نشانەی کە هەیەتی لای هەندێ نادان حورمەتی بگیرێ، ئایا ئەو حورمەتە لەبەر لەقەبەکەیە یا لەبەر خودی خۆیەتی؟ کەوابوو دیارە ئەمە وێنەیێکی ئاشکرایە کەهیچ دەخلێکی بەسەر نەفسی خۆیەوە نییە.

بەڵێ ئەو لەقەبە بەنرخانە ئەوەندە هەیە بە ڕادەیەك سەری پیاو بڵند بکاتەوە، کاتێ لە پێشەوە ئیشێکی کردبێ کە هەموو کەس گەواهی بۆبدا کە ئەو ئیشەی شەرەفدارە، وەئەو لەقەبە بەڵگەی ئەوئیشە بە شەرەفە بێت، بەپێچەوانەی ئەوەش توشی شکاندن و بەدناوی ئەبێ ئەگەر پێشەکی ئیشیکی کردبێ خەڵکی بە ناشرینی بژمێرن، جا ئەو مەدالیایە یا ئەو لەقەبە ئەبێتە سەر روشتە بۆ ئەوەی خاوەنەکەی چی دەس کەوتوە یا ئەبێتە نیشان بۆ ئەوەی چەخراپەییکی لێ روداوە.

سەرنجدەو وورد بەرەوە ئەو(عوسمانی غازی) یەی کە دوشمنەکانی ناویان نابە(شێری شەڕ کەر) گەیشتە ڕوتبەی لەقەبی پێ بەخشراو چوە پایەیەکی بڵند لەناو دەستەی پیاوە گەورەکانی حکومەتەکە، پاش ئەوەی گیانی خۆی هاویشتە گێژاوی مردنەوە بۆ پاسی هۆزەکەی وە هەوڵیدا بۆبڵندکردنەوەی ئایینی خۆی، بەرەنگێك کە دۆست و دوژمنی خۆی دانیان پیانا(هەندێکیش لە پیاوە گەورەکان لەناو ئیسلاما لەقەبی بەرزو نایابیان پێبەخشراوە، لەبری ئەو ئیشانە کە کردویانە بۆ پێشڕەوی سوپای دوژمنەکانیان، تاکو ئەو حکومەتە بێگانەیەیان لە وڵاتەکەیانا جێگیرکردوە،

ئێستاش زۆری موسوڵمانان هەوڵ ئەدەن و کۆشش ئەکەن بۆ ئەوەی شتێك بدۆزنەوە و دەریان پەڕێنن و لەو حاڵە ڕزگاربن).

جا ئەو جیٚ نیشانە لە کویٚ کە بەسنگی عوسمان پاشای غازییەوە بوو لەگەڵ ئەو جیٚ نیشانەی کە بە سنگی ئەو تەفرە دراوانەوەیە، وا ئەزانم بە تەماشا کردنێکی ئەم دوجێیە لێت ئاشکرا ئەبیٚ کە نیشانی شەرەفدار ئەبیٚ بەو فرمانە بەرزەوە کە بەڵگەیە بو ئەو، وەبیٚ نرخیش ئەبیٚ بەبیٚ نرخی ئەو فرمانە، چەشتێك ئەو گومرایانەی لەخۆبایی کردووە؟ ئایا نازانن ئەو بەرگانەی خەت خەت و خاڵخاڵکراون بە خوێن و ڕەنگاورەنگ کراون بە جوانمەردی، ئەوەیە ناوی چاکی پاراستووە بۆ خاوەنەکەی و نابڕێتەوە، وە شوێنێکی گەورەی دروست کردوە کە لەناو ناچیٚ؟ ئەوانەی لە ڕێی هەوڵ و کۆششیٚ کە بۆ بڵندی هۆزەکەیان داوە لە خوێنی خۆیانا تلاونەتەوە، ئەوانەن کە باساینکرا بەترس وسەماوە گوییان لیٚ ئەگیریٚ. وە لەهەموو دڵێکا پایە بڵندییان جێگیربووە، ئایا نەیان بیستووە ئەوانەی مردون لە کون و قوژبنی زیندانەوە ژیانیان کۆتایی هاتوە لە تاریکی بەندیخانەدا لە پێناوی حەقێکی داگیرکراو، یا بۆ پاراستنی گەورەییێك کە بوبێت، ئەوانەن ناویان بڵندبوٚتەوەو گەیشتونەتە ئاسمان ناویان بەسەر گشت ناوێکا بەرزبوٚتەوە.

وا ئەزانم ئەوانەی کە لە ژووری کۆشکی بڵندیانا بوون و تەماشای باخ و بێستانەکانیان ئەکرد و ئەیانڕوانیە خەڵکی لەسەربانی کۆشکە بەرزەکانیانەوە، ژیانی خۆیان ڕائەبوارد بەخۆشی دەست کەوتنیانەوە باسیان کۆتایی هات، وە لە ژیانیانا هیچیان دەس نەکەوت تەنیا ئەوە نەبیٚ کە لە چواردیواریماڵەکەیانا بویانە. هیچ جیاوازییکی ئەوتۆی نیە لەگەڵ ئەوانا، ئەوانەش کە جلەوی نازونیعمەتیان ڕائەکێشاو جلی ئاوریشم و دیبایان پەیا ئەکرد هەموو ڕۆشتن بە خۆیان و جلیانەوە، پاشەوپاش چونەوە بۆ ئەو جێیەی کەلیٚ هاتبوون، نازانرێت کەی هاتونە سەر ئەم زەمینەو کەی کۆچیان لێکردوە ئایا بیستراوە کەسێك ناوبرێت لەناو خەلقاو بڵێن ئەمە نشانێکی وای وەرگرتوە و گەیشتوٚتە پلەیەکی بەرز؟ نا: بەلاّم ئەڵێن تێگەییوو ئیشی کرد، بەخشی و لەناو برد، بڵندی کردەوە وا داینا، تێکۆشاو بەرهەڵستی کرد، لەناو بردو هێشتیەوە لەگەڵ ئەو ئیشانەی کە هاوتایی ئەمانە بکات و شوێنی بمێنی، ئەگەر باسی ئەسکەندەری گەورە بکرێت ئاخۆ بەدڵادێت کە کۆشکی بوە یا نا؟ چەشتیك هەیە بگەڕێت بۆ کردەوەی ناپلیونی یەکەم لە شوێنی ئەو کۆشکەی کە تیا دائەنیشت یالەو جلە شڕوشیتالاّنەدا کەلەبەری ئەکرد، ئایا گەورەکانی دنیا بە خانو کردن و خۆرازاندنەوە و نازو نیعمەت گەیشتونەتە پایەی بڵندی شەرەف یاخو بە گەورەیی وڵات داگیرکردن و سەرکەوتن و زەبرو زەنگ چنگیان کەوتووە؟ هەندێك بەخەو خۆش تەفرەی خواردوە و بایی بوون بە خەیالاّت، وەدەست درێژیان کردوە لە ئیشی نیشتمانەکەیانا، ئەو شەرەف و گەورەیییە بڵندەی کە بویەتی فروشتویانە بەو ناو و ناتورانەی کە بۆ هیچ دانەنراون وە واتێگەیشتون ئەگەر چی دڵیان باوەری پێنەکردوە کە گەیشتونەتە شەرەف و گەورەیی لەپاش ئەمە کە زانیویانە ئەو ڕوتبەو نیشانانە لە سنوری خۆی تێپەریوە وە چنگ ناکەسکەوتوە. ئەگەر ئەوانە بێن و گویٚ بگرن لەوەی کەبەدلیانادێت و لەو سەرزەنشتانەی دڵیان پێیان ئەکات و چاو بگێرن و بە چواردەوری خۆیانا و تەماشای ئەوانە بکەن کە دەوری داون، ئەوسا ئەزانن لە پێش ترین جیٚ سوکترین شوێنی بەد ناویان، وە خۆیان هەست ئەکەن کەلەمعنای شەرەف بەهەڵەچوون، وەتێئەگەن لەڕێی ڕاست لایان داوەو دورکەوتونەتەوە ئەگەر پێبزانن وڵاتەکەیان توشی چە چورتمێکی گەورەبوە، وە چە بەندگی و شورەییەك ئالاوەتە نەتەوەکانیانەوە، بەرگە ڕەنگاو ڕەنگ و مەدالیاکانیان. تورِئەداو بەرگی ڕەشیان ئەپۆشی و بەکومەك لەسەرخۆ ئەگەران بۆ دۆزینەوەی شەرەفی ڕاستەقینە.

شەرەف ڕاستیەکە ئاشکراو دیارە کە ئایین نشانیداوە و بیری زانایانی زەمین سنوری بۆ داناوە، ڕەوانیە هیچ کەس لە ئادەمیزاد دودڵ بیٚ لە تێگەیشتن(مەگەر ئەوە نەبیٚ کە یەزدان دڵی ڕەشکردبیٚ و پەردەی تاریکی بەسەر چاویا کێشابیٚ).

شەرەف جوانی پیاوە، هەموو لێی ورد ئەبێتەوە، بیرو خواهشی دڵان روی تێئەکا، جوانییەکە وێنەی لەبەرچاو ودلان خوشەویستە، رووناکی ئەو جوانییەش ئیشێکە کە خاوەنەکەی بیکاو شوێنێکی جوانی بیٚ لەناو هۆزەکەیا، یا لەناو نەتەوەی هۆزەکەیا، یا تێکرِا لەناو گشت ئادەمیزادا وەکو ڕزگارکردن لە جورتم، یا دەرخستن و لابردنی نەزانی، یا وریاکردنەوە بۆ داواکردنی حەقێکی داگیرکرابیٚ، یا وریاکردنەوە لە هەلئەنگوتن، یا بیدارکردنەوە لە بێهۆشی، یا ڕێنیشاندان بۆ چاکەییکی گشتی، یا پاراستن لە خراپەیەك دڵتەنگی لە دوابیٚ، یا لەناوبردنی کردەوەی ناشرین یا بیر ڕووناککردنەوە، یا هێنانە بەرهەمی یەك قسەیی و تازە کردنەوەی دوستایەتی، یا سەندنەوەی هێزێك و ڕزگارکردنی لەبیٚ دەستەلاّتی، یا هاندان بۆ ئازاییەك، کەوابو کەسێك ئەگەر ئیشێکی کردو شوێنێکی بو لەوانەی کەوتمان ئەوە(شەریف)ە بام لەناو زنج و ژێر گەلاّ دارا دانیشتبیٚ و جلە کۆن و خەرقەشری لەبەرابیٚ و سەوزایی دەشت و خواردەمەنی بێت و شەو لەسەر گڵی هەژاری ڕۆژبکاتەوە و بەرد بکا بە سەرین و سەر بە هەموو دۆڵێکا بکا، وە هاتوچۆ بکا لە بەرزایی و نشێویدا، ئەمە خشڵێکی هەیە لە کردەی خۆی، جوانییەکی هەیە لە پێگەیشتن، ڕەونەقێکی هەیە لە کەماڵی، ڕووناکییەکی هەیە لە تێکۆشینی ئەوانەی هۆشیان لیٚ گوم بوبیٚ و دڵیان پەرێشان بیٚ روی تێئەکەن، خاوەنی بیری ورد ئەیانناسن و رویان لیٚ

وەرناگیێرن کۆمەلی دلانی پاك و ئاوارە دەورەیان لێ ئەدەن و لێیان جویێ نابنەوە، لەو گیانەی کۆشکی بلندو ژوری ڕەنگاو ڕەنگ دیمەنی جوان جوان و جوانی پڕ لە ڕووناکی و پرشنگی درەخشانی هەیە، ووشەی پیرۆزی ڕوو لەو ئەکا ئیشی جوانیشی بلندی ئەکاتەوە بۆ بەرزترین بەرزی، ژیانێکی پیرۆزی هەیە لەولاتەوە شکوهێکی درەخشانی هەیە لەچاوی گەردونا(ئەوانەی کەتیێ ئەکۆشن با بۆشتیوا تیێبکۆشن).

بەلیێ زۆرجار قسەی ناشرین و سەرزەنشت روی تیێئەکا لەلایەن ئەوانەی کە دلێ و دەرونیان پیسە، پلارو توانجی تیێئەگرن و لۆمەیی ئەکەن، خونچەی کردارو گۆپکەی درەختی باخەکەی لەبەر چاویان جوان نانوێنیێ، چونکە لە تیێگەیشتنی ئەوانەی دورە و عجائبەلەلایان لەبەرئەوەی هیێندە بەسەر ئەو شتە ناشرینانەدا کەوتون کە خۆیان بە شەرەفی ئەژمیێرن و بەگەورەیی ئەزانن، ئیێمەش باسمان کرد کە چۆن ئاشکرای کردوە لەگەلێ بیری تیێگەیشتوان، ئەوانە وەکو قالۆنچە وانە کە لە بۆنی گولێ ڕائەکا و ئەچیێتەناو شتی بۆگەنەوە هیچ بە دوری مەزانە ئەوانەی کە کرداریان جوان نیە گالتە بکەن بە زانای ئیشکەر، یا بیەویێت زیانی پیێبگەیینی ئەوەی کە هیچ کەس نایناسیێ، بەلام گالتە بە خۆیان ئەکەن وەزیان لە سودی خۆیان ئەدەن گەردون ئەوەندە ماوەیان نادات لەو کویرەوەریەدا کە تیێی کەوتون بگرە خۆشیان خۆیان ناگرن ئەگەر میوەی کرداری هاتەبەر بە کۆمەلێ ڕائەکەن بۆ چنینی وە بەشی ئەوەشی لیێئەدەن کە زیان پیێگەیاندوە، ئیتر هیچیان لەبارا نامیێنیێ مەگەر هەر سوپاسی ئەوە بکەن کە ئەو درەختەی ناشتوە و چاودیێری بەرەکەی کردوە، هەرچەندە لەوان خوارتر بیێ لەوشتە پڕوپوچانەدا کە نرخی نیە لای پیاوی تیێگەیشتو جا لەتۆلەی ئەو ئیشە خراپانەدا کە کردویانە هیچمان بۆ نامیێنیێتەوە تەنیا ئەوەنەبیێ کەلە کردەی خۆیان پەشیمان ببنەوە وەخەمی خراپی خۆیان بخۆن و دلتەنگبن بە دلکاتی بە خراپی خۆیان بزانن وەبەتەواوی لە کەم و کورتی خۆیان بگەن.

ئە ئەوها چاودیێری یەزدانی پاك ئەم گەورەیییە ئەبەخشیێ بە خاوەنی ئیشی پیرۆز هەتا زیندو بیێ، کاتیێ کە ڕۆژی ژیانی لە ئاسۆی ئەم گیێتیەوە گوم بو، ئەو پرشنگی روناکیەی ناشاریێتەوە کە سارپیێژی کردوە بەسەر ئەستیێرەی ڕیێنیشاندەرو مانگی شەوی چواردەدا، بەلیێ ئەمریێت و ئەچیێتە ژیێرپەردەی نەمانەوە بەلەش بەلام هەمیشە لە دلانا ئەمین وەبەزمان باسی ئەکریێ زیندوەلای خوا خواردەمەنی ئەدریێتی ژیانی ئەو شیرینترین ژیانە(وە ئەبیێ ئادەمیزاد بۆ ئەم جۆرە فرمانانە هەولێ بداو تیێبکۆشیێ)

- لە گۆڤاری (عروه الوثاق) ی جەمالەدینی ئەفغانی و شیێخ محەمەد عەبدەوە وەرگیێڕاوە.

**سەرچاوە**

هەمان سەرچاوەی پیێشوو



# نموونەیەك لە وەرگێڕانی كتێبی قوتابخانە

## چیرۆك -١-

عمرانی باوكی مریم لە پیاوە گەورەكانی بنی ئسرائیل بوو، ژنێكی هەبوو، زگی نەئەكرد. بڕیاریدا ئەگەر بێت و زگی پڕ بوو، منالەكەی بكا بە نوكەری(بیت القدس) ئاواتەخوازبوو كە نێرینەشبێ، بەلام كە بوویان مێیینەبو وتی:

"رَبِّ إنِّي وَضَعْتُها أُنثى وَاللُّه أَعْلَمُ بما وَضَعَتْ وَلَيْس اَليْسَ الذَّكَرُ كالأنْثى وَإنِّي سَمَّيْتها مَرْيَمَ وَإنِّي أُعيذها بِكَ وَذُرِّيَّتَها مِنَ الشَّيطانِ الرَّجيم".

كە باوكی مرد میردی پووری كە زكریابوو چاودێریی كرد وەهەر جارێ بچوایە لای(رزقیكی) ئەوتوی لا ئەبینیٚ لە خواییەوە كە لای هیچ كەسێكی كەچنگ نەئەكەوت، وەكو هەموو جۆرەمیوەیەك لە ناوەختا، كەلێی بپرسیایە، ئەی وت ئەمەلە خواوەیە، كە گەورەبوو جێگایەكی جیاوازی بو خۆی تەرخان كرد. رۆژێ لە رۆژان كە مریم خەریكی خوا پەرستی بوو وحزرەتی جبرەئیل لە وینەی پیاویكا چوە لای، ئەویش تەنها بوو لێی ترسا بەلام هێنایەوە سەر خۆی وەپێی وت: من لەلایەن خواوە رەوانە كراوم بۆ لای تۆ كە خەبەرت بدەمی خوا وەند كوڕێكی وەجاخ زادەی پێبەخشیت، لە دنیاو قیامەتا گەورەیە، هەر وەكو بە گەورەیی قسە لەگەڵ خەڵكا ئە كات بەو ڕەنگە بەمنالیش قسەیان لەگەلا ئەكا سەری لەقسەكانی جبرئیل سورما وتی: چۆن منالم ئەبێ كە هێشتا شووم نەكردوە؟ پێی وت یەزدان توانای بەسەر هەموو شتێكا هەیە، ئەگەر ویستی شتێك دروست بكا هەر كە فەرمووی(ببە) ئەبێ.

مریم لە خواییەوە زگی بەعیسا- سەلامی خوای لێبێ- پڕبوو، كە كایتی منالٚ بوونی هات چوە ژێر دارخورمایە كەوە وەعیسای بوو. ترسا كە قەومەكەی ئازاری بدەن عیسا هایتە زمان وەپێی وت: خەفەت مەخۆ ومەترسە خواوەند تۆ لە هەموو ئازارێك ئەپارێزێ.

قەومەكەی هاتن عیسایان دیی لەپێشەوە سەرزەنشتیان كرد، بەلام عیسای نیشان دان كە لە بێشكەدابوو وتی قسەی لەگەلا بكەن وتیان ئێمە چۆن قسە لە گەڵ منالا بكەین، لە بێشكەكەدا لێیان دەهاتە قسەو فەرموی: من بەندەی خوام لەلایەن خویەوە كتێبكی پێبەخشیوم، منی كردوە بە پێغەمبەر بۆسەر مەردوم وەرای سپاردم كە نوێژ بكەمو زەكات بدەم وە بەقسەی دایكم بكەم ومنی بەبێفیزو دلسۆزو كردار چاك دروست كردوە.

چیرۆكی گەورەمان عیسا

لە سورەتی"ئەلمائدە"

بِسْمِ اللّهِ الرَّحمنِ الرَّحيم

"إذْ قالَ اللّهُ يا عيسَى بْنُ مَرْيَمَ اُذْكُرْ نِعْمَتي عَلَيْكَ وَعَلَى والِدَتِكَ إذْ أيَّدْتُكَ بِروُحِ الْقُدسِ تُكلِّمُ النَّاسَ فِي المَهدِ وَكَهْلاً وَإذْ عَلَّمْتُكَ الكِتابَ والحكمةَ وَالتَوْراةَ والإنجيل وَإذ تَخْلُقُ مِنَ الطينِ كَهَيْئةِ الطَيرِ بإذْنِي فَتَنْفُخُ فيها فَتَكُونُ طيراً بإذْنِي وَتُبْرِئُ الأكْمَهَ وَالأبْرَصَ بإذْنِي وَإذْ تُخْرِجُ المَوْتَى بإذْنِي وَإذْ كَفَفْتُ بَنِي إسْرائيلَ عَنْكَ إذْ جِئْتَهُمْ بِالبيِّناتِ فَقالَ الَّذينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ إنْ هَذا إلاّ سِحْرٌ مُبِينٌ".

| وتە | ماناكەی |
|---|---|
| أیدتك | بەهێزم كردیت |
| بروح القدس | جبرئیل |
| كهیئة الطیر | لەو وینەی باڵندەدا |
| باذنی | نە خواهشتی خوم |
| كففت | تەم هیشت |
| البینات | پی نواندن"معجزە" |
| الاكمە | كویری زگ ماك |

## چیرۆك -٢-

عیسا-سلامی خوای لێبێ- گەورەبوو، خوا ناردی بۆسەر بەنی ئیسرائیل فێری نوسین و خوێندنەوەیان بكاوە خەبەریان بداتیٚ كە خوا یەكە، جگەلەو خوایەكی كە نیە، بە درویان خستەوەوە پێیان وت ئێمە ئیمان بە تۆ نایهێنین وە بڕوات پێناكەین تا بەڵگەیەكی ئەوتۆمان تیشان نەدەیت كە ئیسپاتی پەیامەكەت بكا، پێیان وت: باڵندەیەكمان بۆ درووست بكە تا ئێمە بڕوات پێبكەین، خواوەند فەرمانی پیدا كە لە قوڕ باڵندیەكیان بۆ دروست بكا و فووی پیاكا ئەوسا لە خواییەوە ئەبێ بە باڵندەیەكی گیان لەبەر و ئەفڕێ.

لەوەختی عیسادا-سلامی خوای لێبێ- گەڵێ پزیشكی بیر تیژهەبوو، خواوەندیش ویستی عیسا بكابە پزیشكی لە وان گەڵێ چاكتربێ لە چاك كردنەوەی نەخۆشا خوا چاك كردوەتەوەی كویری زگماك و نەخۆشی بەلەكی بۆئاسانكرد، كە پزیشكەكان رییان بەچاك كردنەوەی ئەم جۆرە نەخۆشیانە نەئەبرد، هەروەها لە زیندووكردنەوەی مردودا باش دەستی ئەرۆیشت هەر ئەوەندە لە خوا بپاڕایەوە كە مردوەكە زیندوو ببێتەوە خوا پاڕانەوەكەی گیرا ئەكرد وە زیندوو ئەبوەوە.

گەڵێ كەس ئیمانیان پێهێنا وەئەوانەی ئیمانیان پیٚ هێنا داوایان لێكردكە لە خوا بپاڕێتەوە سفرەیەكیان بۆ بنێرێتە خوارەوە، خواردەمەنی لەسەربێ وەلێی بخون عیسا پێی وتن لە خوا بترسن ئەی ئیمان دارینە، لەپاشا خوا پاڕیایەوە، خواش دوعاكەی گیراكرد وەسفرەیەكی بۆ ناردنە خوارەوە، لێیان خواردوە دڵنیابوون، لەگەڵ ئەم هەموو معجزانەدا كە نواندی گەڵێ لەبەنی ئیسرائیلیەكان بە درویان خستەوە، بەلام ئەو كۆلێ نەدا هەر بانگی ئەكردن بۆخوا پەرستی، ئەوانیش هەر لەمان گری و نەگریسی خۆیانا مانەوەوە بڕیاریاندا كە بیكوژن، خوا لە دەستیان رزگاری كرد بەم جۆرە، پیاویكیان دیی لە عیسا كوڕی مریم ئەچوو، وایان زانی ئەوە كوشتیان بەلام عیسا خوا بردیەوە بۆ ئاسمان.

### سەرچاوە

ئاین زانی، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوەوەزارەتی مەعاریف، بەغدا، ١٩٤٦.



# پێکەس..

محەمەد مەلا کەریم

سولەیمانی هەر لە سەرەتای دروستکردنیەوە لەسەر دەستی بابانەکانا، مژدەی جیهانی نوێی بۆ کوردستان پێبووە. کە کرایەوە، بۆ ئەوەکرایەوە پێتەختی میرنشینی‌یەکی کوردبێ، میرنشینی‌یەك هەرچەند بۆی نەلوا ببێ بەو میرنشینی‌یەی میرنشینی‌یەکانی تری کوردی لەدەور خڕببنەوەو یەکیانبخاو قەوارەی دواڕۆژی نیشتمانیان لێپێك بێنێ، بەڵکو لە تاقیکردنەوەیەکی لەوەپاشیشدا هەر بۆی نەلوا هیچ نەبێ هەر خۆی بەتەنها وەك مەڵبەندی میرنشینی‌یەك بمێنێتەوە، لەگەڵ سەریترەوە لەبەشی باشوورو ڕۆژهەڵاتی نیشتمانەکەماندا بوو بەبناغەو چەکەرەی کوردستانی نوێ و هاوچەرخ.

کە چاوێك بە مێژووی ڕابوردوودا ئەگێڕینەوە، ئەبینین ئەدەبی نوێی زاراوەی کرمانجیی خواروو بۆ یەکەمجار لەم شارەدا سەری هەڵداو وردە وردە گوێی پێشبڕکەی لەئەدەبی گۆرانی و کرمانجیی ژووروو بردەوە.. ئەبینین ئەم شارەبوو هەر لە سەردەمی عوسمانییەکانا زۆرترین ژمارە خوێندەواری، لەچاو شارەکانی تری کوردستانی باشووردا، ناردە دانشگاو خوێندنگاکانی ئەستەموول.. ئەم شارەبوو لە کودستانی باشووردا یەکەمین چاپخانەی تیا دامەزراو یەکەمین ڕۆژنامەی کوردیی تیادەرچوو.. هەر لەم شارەوەبوو یەکەمین پێوەندی گەلی کورد بە سیستێمی نوێی سۆشیالیستی‌یەوە دەستی پێکرد کە پاش شۆڕشی پیرۆزی ئۆکتۆبەر هاتە سەر ڕووی کارو، ئەوەبوو شێخ مەحموودی نەمر لێنینی مەزن نووسیو، هەر ئەم شارەش بوو(سۆن)ی نوماینەدەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز لە ڕاپۆرتێکیدا بۆ کاربەدەستانی سەرەوەی خۆی، گلەیی-بەداخەوە- بڵاوبوونەوەی ناووناوبانگی بۆڵشویکیی تێدا ڕاگەیاند.. لەهەمووش بایەخدارتر ئەم شارە بوو بوو بە مەڵبەندی یەکەمی بزووتنەوەی سیاسی و شۆڕشگێڕیی بەشی باشوور و ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکان و تا ئێستاش ئەم سەربەرزییەی هەر ماوەو پایەدارەو لەسەر لاپەڕەکانی مێژووی ڕۆژگاردا نازی پێوە ئەکات.

شارێ پشتیرێکی مێژوویی و سیاسیی وا دەوڵەمەندی هەبێ و ئەوەندە هاوچەرخ بێو لەگەڵ پێویستییەکانی ژیانی نوێدا بەم چەشنە لێك ئالابن، ئەبێ هەمیشە مەڵبەندی سەرهەڵدانی بنووس و چاکەخوازی کەڵە کەڵەی وابێ نەتەوەو وڵات شانازییان پێوە بکەن و دەربڕی ئازار و ئاواتەکانیان بنو، لەسەر تابلۆی نەخشەی سەرانسەری نیشتماندا وەك ئەستێرەی گەش و پرشنگدار بریسکێتەوە.

ئەگەر پێش جەنگی یەکەمی جیهان سولەیمانی لەم مەیدانە پرشانازییەدا شاری تاقانەی کورد نەبووبێ و لە کوردستانی تورکیادا، بەتایبەتی، گەلێ شاری تری وا هەبووبن هاوبەشی ئەم شان و شکۆیەی بووبن، خۆ هەموومان ئاگادارین کەوا لەدوای ئەو جەنگەوە نەخشەکە بەجارێ گۆڕا. سەرپانکردنەوەی بزوتنەوە میللییەکانی کوردستانی باکوورو ڕۆژهەڵات، هەرچەند شان بەشانی سەرپانکردنەوەی حوکمداریتی و پاشان شۆڕشەکانی شێخ مەحموودیش بوو، بەڵام شاری سولەیمانی، بەپێچەوانەی ئەو بارە نابارەوە کە شارەکانی کوردستانی ئێران و تورکیا تێیکەوتبوون، درێژەی بە خەباتی خۆی داو، ئەگەر لە مەیدانی حوکمڕانیشدا کێشەکەی دۆڕاندبێ، لە مەیدانی سیاسەت و کۆڕو کۆمەڵە پێکهێنان و بزووتنەوەی کولتووریدا بەردەوام بووەو درێژەی بە خەباتی خۆی داوە و لەم مەیدانەدا دەسکەوتی مەزنی وەدەست هێناوە و لاپەڕەی زێڕینی زۆری خستووەتە سەر مێژووی خەباتی سەختی ئەو وڵاتەی ئەم ڕۆڵەی جگەرسۆزو شیرینیەتی.

پاش ژێرکەوتنی شۆڕشەکانی شێخ مەحموود و لە ئەنجامی ئەو هەموو کەموکورتی و ناتەواوییانەدا کە لە دەزگاکانی شێخدا هەبوون و ڕۆشنبیرانی سەردەم هەمیشە باسیان ئەکردن و هەوڵی ڕاستکردنەوەیان ئەدان و، لە ئەنجامی ئەوەشەوە کە تەزوویەکی بێمتمانەیی بەوە کە گەلی کورد شایانی ئەوەبێ قەوارەی خۆی هەبێ و ببێ بەخاوەنی دام و دەزگای تایبەتیی خۆی بەناو توێژێکی فراوانی خەڵکدا بڵاوبووبوەوەو، داگیرکەریش لەلایەکەوە بەجۆرێك هانەهانەی ئەم تەزووی بێمتمانەیی‌یەی ئەداو، لەلایەکی کەشەوە بێدەسکەوت نەبوو لەوەدا کە کەسانی هوشیارو ڕۆشنبیر، لەجیاتیی ڕێگای سیاسەت و خەباتی چەکبەدەستی، ڕێگای کولتوورو پێشخستنی گەل لە ڕێگای کولتوورەوە بگرنەبەر، چونکە هەرچۆن بێ ئەو ڕێگایە بەشبەحاڵی پارێزگاریی بەرژەوەندی ئەو، لە ڕێگای خەباتی سیاسی و چەکدار کەم مەینەتتر بوو.. لە ئەنجامی

هەموو ئەم هۆیانەوە تەوژمێکی گەورەی ڕۆشنبیری وەچەی خوێندەواری خەڵکی سولەیمانی و دەوروپشتی گرتەوەو کۆمەڵێك شاعیر و بنووس پەیدابوون لەم مەیدانەدا بەگەرمی تێئەکۆشان.

بەلاّم زۆری پێنەچوو ئەو سڕی و کاسییەی بەسەر خەڵکەکەدا هاتبوو ڕەوییەوەو، بەهۆی دامەزرانی قەوارەی یەکگرتووی عێراق و پێوەندی بەیەکەوەکردنی کۆمەلانی عەرەب و کورد و یەکتری ناسینی ڕۆشنبیران و سیاسەتکاران و تێکۆشەرانی هەردوو لاوە، خەباتی خەڵکی بەغدا بەتایبەتی و ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراق تێکرا لەدژی ئینگلیزی داگیرکەرو ئەو پەیمان و ڕێککەوتننامانەی ئەیوست بەسەر خەڵکیاندا بسەپێنێ، لە کوردستانیشدا دەنگی دایەوەو، ئەوەش یەکێك بوو لەو هۆیانەی گوژمێکی نوێیان بە خەڵکەکەداو، بەتایبەتی شاری سولەیمانی کە هەمیشە هەرپێش دەست و پێش قەرەوڵ بووە، بۆ وەبیرهێنانەوەو دەست خستنی مافەکانی گەلی کورد ڕێگای توندو تیژیی گرتەوەبەر.

بێکەسی شاعیر یەکێك بوو لەو ڕۆشنبیرانەی ئەم تەوژمە نوێیە لە دەروونیانا دەنگی دایەوەو، بۆمبای یەکەمی لە وشە دروستکراو کە هەرگیز ساردبوونەوەو لەکارکەوتنی بۆنییە، کە بێکەس لە خەباتی ئەو سەردەمەدا تەقاندییەوەو خۆیشی بە جەماوەر پێناساند، شیعرەکانی بووکردنی بە چەکی دەستیوپێیانەوە چووە شەڕی بەردەرکی سەراو خەباتی پیرۆزی ڕۆژی ڕەش و گەشی شەشی ئەیلوولەوەو تا مرد فڕێینەدا.

بێکەس شاعیرێکی زاتی نەبوو تا شیعر بۆ داخە تایبەتی‌یەکانی خۆی تەرخان بکا. لای بێکەس شیعرو خەباتی سیاسی و کۆمەلایەتی و بلاوکردنەوەی گیانی شارستانەتیی نوێ، هەموو ئامێتەی یەك بوون و لە یەك جوێناکرێنەوە.

بێکەس تەنانەت وەك گۆرانی تا سەرەتای ساڵەکانی پەنجاش نییە کە هەر عەودالی دوای جوانی و سروشت و هونەر بووبێ و، ئەگەر جاروبار شتێکی تایبەتیی وەك تابلۆیەکی شەڕی بەردەرکی سەرا، یا وەك خنکاندنی مەحموود جەودەت، یا وەك پاشکەوتوویی لەڕادەبەدەری کوردستان بە بەراورد لەگەڵ جوانیی سروشتی و ئاواتی دواڕۆژی گۆران خۆی پێی، یا وەك مەترسیی فاشیزم یا دیمەنی سامناکی یەکێ لەکولۆلییەکانی مروڤایەتی لە ولاتێکی وەك ولاتی خۆماندا، تەکانێکی توندی پێنەدابێو نەیهەژاندبێ، شیعری لەو چوارچێوەیە دەرنەچووە کە وتمان، کە ڕاستەکەشی ئەگەر ناچاری ئەرکی تر نەخاتە ئەستۆی شیعر، ئەرکی هەر ئەوەیە گۆران لەو سەردەمەدا تەرخانی کردبوو بۆی. وەك پیرەمێردیش نیە کە لە خولگەی پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و بەتوێکڵ وحیکمەتی کۆمەلایەتیدا بسوورێتەوەو، ئەگەر جاروباریش ڕووداوێك پێویستیکرد خۆی بخاتە کۆڕی سیاسەتیشەوەو گوڵێ بەسنگی خەباتی گەلدا بکا. وەك کەسێکی لە چەشنی مەلای کۆیەش نییە شۆڕشگێڕییەتی‌یەکەی تەنها لەدژی دیمەنەکانی پاشکەوتنی کۆمەلایەتی بخاتە کارو هەقی بەسەر بنەمای پاشکەوتنەکەوە نەبێ کە باری سیاسییە.

بێکەس شاعیرێکە شیعر چەکی دەستی بووە لە خەباتدا. جا بۆیە ئەگەر سادەیی و ڕەوانی و بێوێنەیی‌یەکی زەقمان تێکڕا لە شیعری بێکەسدا بێتە بەرچاو، نابێ گلەیی لە بێکەس خۆی بکەین بۆ واشیعری لە خاسیەتە بنەڕەتی‌یەکانی دامالیوە؟ ڕووی دەمی گلەیی ئەبێ بکرێتە ئەو بارو چەرخە ستەمکارە کە بێکەسی ناچار کردووە لەپێناوی وریاکردنەوەی گەلدا واز لەگەڵ ڕووی هونەری شیعر بێنێ و شیعری سادەو سووك و ئاسان داڕێژێ تا خەڵکی پێ وشیارکاتەوە. بەختی بێکەس لەمەدا لەوە ئەچێ وێنەکێشێکی بەناوبانگ ناچاری ئەوەببێ دەرزی ئەلف وبێ بەمنالان بلێ.

بێگومان ئەرکی ئەلف وبێوتنەوە بە منالان ئەرکێکی ئێجگار پیرۆزە، بەلاّم دیارە لەبارەی شارستانەتییەوە بۆشاییی ئەوە پڕناکاتەوە کە هونەرمەندێکی بالای وێنەکێشمان لەدەست بچێ.

ئەگەر کۆمەڵەی ئەو هونەرمەندە وێنەکێشە، کۆمەڵەیەکی بەختەوەر بوایە لەسەر مامۆستای ئەلف وبێوتنەوە پەکینەئەکەوت و، ئەمیش بۆی ئەلوا خۆی بۆ هونەرەکەی خۆی تەرخان بکات و وێنەی جوان بۆ ئەم خەڵکەو بۆ دەوڵەمەندکردنی جیهانی هونەر بکێشێ. بێکەسی ئێمەش هەروا. ئەگەر باری سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووریی دواکەوتووی کورد ناچاری نەکردایە شیعرەکانی بۆ چارکردنی ئەم دەردانە تەرخان بکات، لەوانەبوو ئەویش وەك گۆران، یا چەردەیەك لەو ئایەختر، دەیان پارچە شیعری ناسکی وەك ئەوانەی پێش بە ناخی سیاسەتا چوونە خواری گۆران، وەك(ئەی مانگ)ەکەی خۆی بلێ.

لە کوردستان و ولاتە پاشکەوتووەکانی وەك کوردستاندا، باری پاشکەوتووی کۆمەڵ ئەرکی ئەوتۆی خستووەتە سەر شانی شیعر، خەڵکەکەش وایان لێهاتووە وا ئەزانن لە ڕاستیدا شیعر بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکانە داهاتووە، کە واش نییە. ئەگەر کۆمەڵ بە ڕۆژی بەختەوەریی خۆی گەیشتبوایە، شیعر کە بۆ ئەوە دانراوە یەکێکی وەك مەولەوی بیلێ کە ئەزانێ چۆنی ئەلێ، بۆ بابەتی وابووترێ کە هەرگیزاو هەرگیز مردن بەخۆیەوە نەبینێ، لە هەموو کاسەیەکدا نەئەبوو بە کەوچك و لەهەموو دیزەیەکدا نەئەبوو بە ئەسکوێ... مەلای مزگەوت نەیئەکرد بەهۆی فێرە تارەتگرتن و دەسنوێژشتن و نوێژکردنی خەڵکی نەخوێندەوارو منالی قوتابخانە... خاوەنی(ئەحمەدی) و خاوەن ئەحمەدییەکانی تر نەیانئەکرد بە فەرهەنگ بۆ زمانی بێگانە بە منالان فێرکردن... سیاسییەکان نەیان ئەکرد بە چەکی وروووژاندنی خەڵك بۆ خەبات لەدژی داگیرکەران و خوێن مژان.. ڕۆژنامەنووسە شۆڕشگێڕەکان جێگای سەروتاری ڕۆژنامەو

گۆڤارەکانیان پێڕەش نەئەکردەوە... ڕەشە خەڵکەکەش نەئەهاتن تاقیکردنەوەی کۆمەڵایەتیی خۆیانی پێدارێژن.. ئەمە هیچی لەبنەڕەتا ئەرکی سەرشانی شیعرنییە گرتوویەتیە ئەستۆی خۆی یا خستوویانەتە ئەستۆی. بەڵام وەك ئەڵێن"ڕووی نەبوونی ڕەش بێ".

ناچاری حەرام حەڵاڵ ئەکاو شتێك نییە کەس لە ئاستیا بتوانێ بڵێ(لەل).. بۆیە ئەگەر لای ئێمەش، وەك لای هەر گەلێکی وەك ئێمە، لە ڕێگای شیعرەوە دەرزی ئایین بە منالأن بڵێن و، (شێخ مارفی نۆدێ) بە شیعر(کاك ئەحمەد)ی کوڕی فێرە عەرەبی بکاو، (حاجی قادری کۆیی) کۆمەڵانی دواکەوتووی کوردستان بە شیعر وشیار بکاتەوەو، مژدەی جیهانی نوێی پێ بێنێتە وڵات و، (پیرەمێرد) قسەی نەستەق و تەجرەبەکانی ژیانی کۆمەڵ بە شیعر بهونێتەوەو، (قانیع) بە شیعر جووتیاران لە خەوی بێئاگایی ڕاست بکاتەوەو، لەدژی دەرەبەگی خەرمان تالأن کەرو شێخی مفتەخۆرو مەلای دەس بڕو بازرگانی بەسوود و سەلەم سەوزخریان بووروژێنێ، دیارە ئەبێ(بێکەس) و بێکەسەکانی تریش هەروا بکەن و بیکەن بەچەکی خەبات و پرۆگرامی سیاسی و ڕاستکەرەوەی باری کۆمەڵایەتی و ئاوێنەی دەربڕینی داخوازییە کۆمەڵایەتییەکان و، بەڵکو ئەگەر وا نەکەن، لە ئاستی گەل و نیشتمانەکەیاندا بە کەمتەرخەم و درێغیکردوو دائەنرێن و ڕاستیشە ئەبێوابن. شیعری کوردی کە لەبەرناچاری هێنرایە ئەم مەیدانانەوە، پیاوانە لە هەقی ئەم ئەرکە تازەیەش هات و تاسەردەمێکی درەنگی لەمەولاش ئەم دەورە هەر ئەبینێو، هەڵەو تاوانە بمانەوێ ئەکتەریی ئەم شانۆنامەیەی لێ بسەنینەوە.

بۆیە ئەگەر شیعر لەم مەیدانەدا لەسەرجادەو لە ناو پۆلی قوتابخانەو لە دەرگای مزگەوتەکان و گەڕەکەکانی هەژاراندا تۆزاوی و خۆڵاوی و قوڕاوی بوو، جار جار شیعرێکی کاڵوکرچ یا لارو وێر یا سادەو بێ وێنەی لێ دەرچوو، گلەیی لە شاعیر ناکرێ و شاعیر بەرابەر بە هونەر بە تاوانبار دانانرێ.. خزمەتی خەڵکی کردووە کە لەپێش هەموو ئەرکێکەوەیە تەنانەت بە پاراستنی نازداریی هونەریشەوە. ئێمە ئەگەر بمانەوێ شیعرمان لە ناسکیی پەڕەی گوڵ و پاراویی ڕەشە ڕێحانەو جوانیی ساقی وەنەوشەو دەم بەخەندەییی چاوی نێرگسدا بێ. کچێکی شۆخی چاوڕەشی قژ درێژو شانە کراوی شەپۆل بەسەر شانا هاتووە خوار بێ، ئەگەر بمانەوێ شیعرمان خۆراکی گیان بێو هەمیشە هەر نەمرێ، ئەبێ تێکۆشین کۆمەڵەکەمان بگەیەنینە ئەو ئاستە بۆ هەر کارێکی هۆی تایبەتیی خۆی بەکاربێت.

جابەشبەحاڵی شیعریش، کە کوڕ و کۆمەڵەی سیاسی و دەربڕی ئاواتی خەڵکمان بەئازادی هەبوو، کە ڕۆژنامەو گۆڤاری سیاسیمان بە فراوانی و مشەمەری پێدەرکراو هەموو خواست و داخوازییەکی خەڵکیان تیا یەکالأکرایەوە... ئەگەر توانیمان بێترس و لەرز ڕەخنە بگرین و پێویستمان بە شیعری ڕەمزی نەما بۆ ڕەخنەگرتن، کە کۆبوونەوە و کۆڕبەستن بەرەڵڵابوو، وتاری بێپێچ وپەنای تیا خوێنرایەوە، ئەوکاتە پێویستمان بەوە نامێنێ بۆ دەربڕینی داخوازییەکانمان پەنا بەرینەبەر بەکارهێنانی توندو تیژی و، پێویستمان بەوەش نامێنێ تووڕەییی خەڵك بووروژێنین و سەرەوژێری ناو شەقامەکانیان بکەینەوە. ئەوکاتە شیعریش ئەو مەیدانانە بەجێدێڵێ کە لە بنەڕەتدا هیی ئەونین.. ئەچێتەوە ناو باغچەو گوڵزاری خۆی و، لەپشت پەردەی ناسك و پەنجەرەی شووشەبەندی ڕەنگاو ڕەنگدا دائەنیشێتەوە چاوەتاتکێ لەگەڵ دڵدارەکانی ئەکا.. شیعرمان ئەبێ بە شیعرێکیتر، غەیری ئەوەی ئێستا زۆربەی ناوچەی شیعری داگرتووە. لە ناسکیی شیعری مەولەوی و بێسارانی و کوردی و گۆران و هەردی و هەموو شاعیرە هونەرمەندەکانی ترمانا ئەبێ و، مەسەلەی پێوەندی نێوان کاری هونەری و خزمە تی کاروباری ڕۆژانەی کۆمەڵ ئەکەوێتە ناو چوارچێوەی ڕاستەقینەی خۆیەوە.

بێکەس تێکۆشەرە بەرلەوەی شتێکیتربێ. تێکۆشەری سیاسییە. تێکۆشەری کۆمەڵایەتی یە مامۆستای منالأنیشە. شاعیریشە. بەڵام ئەو تێکۆشەرە نیە کە بۆ ڕاگەیاندنی بیروباوەڕی خۆی پەنا بەر کۆڕ و کۆمەڵەو شان و ڕۆژنامە و بەیاننامە بەرێ. چەکی دەستی هەموو هەر شیعرەکانی و هاوجووتیی گوفتارو کرداریەتی. ئەو مامۆستایەش نییە میری کتێبی بۆ دابنێ و ئەویش ئەوەی لەسەر بێ بۆ منالأنی لێکبداتەوە دیارە نابێ دەسبەرداری کتێبەکانی میری ببێ، بەڵام خۆیشی بابەتێکی هەیە بە منالی بڵێ. کتێبی ئەم بابەتانەیشی شیعرەکانیەتی، چ شیعری منالأن و چ سروودی سیاسی.

بێکەس شاعیرێکی نەتەوەپەرستە. وەك بنووسێك لە یادی دە ساڵەی کۆچ کردنیدا نووسیویەتی دوای حاجی قادری کۆیی یەکەم هەڵگری ئاڵای کوردایەتی و نەتەوەپەرستییە. وەك مامۆستا ڕەفیق حیلمیش ئەیگێڕێتەوە ڕەخنەنووسێکی ئەدەبیی فەرەنسەیی لە ڕیزی شاعیرە قەومییە تازەکانی کوردا ئەیژمێرێ. من لاموایە ئەم ڕەخنەنووسە هەقی تەواوی بێکەسی نەداوەتە دەست، بەڵام کەس وای بۆ نەچێ من کەوتم بێکەس شاعیرێکی نەتەوەپەرستە، مەبەستم ئەو مەعنا سادەو کاڵو کرچەیە لە ئەدەبیاتی سیاسیدا نەتەوەپەرستیی پێ مەعنا لێئەدەنەوە. جاری لە هیچ شیعرێکی بێکەسدا هیچ جۆرە گیانێکی نەتەوەپەرستیی شێت گیرانە و بەکەم زانینی نەتەوەکانیتر بەرچاو ناکەوێ، هەرچەند ئەو بارە سیاسی و کولتوورییەش کە تیا ژیاوە ئەوەی بۆ تەخت نەکردووە لە مەعنای پێشکەوتخوازانەی نەتەوە پەرستی بگات و ڕێگاکانی بەرپێی بە جۆرە شۆڤێنیەتێکی نەگەیەنن.

بێکەس کە لەگەڵ ڕاپەڕینی بەگوژمی

جەماوەری ڕۆژی ڕەشی شەشی ئەیلوول و شەڕی بەردەرکی سەرادا، بۆ یەکەمجار، ئەتەقێتەوە، کە شەڕێك بووە بەرامبەر بە ئیمپریالیزم و دەولەتی ناوخۆی دەسنیشاندەی، بە دلێکی وەك بورکانەوە دێتە کوڕی خەبات و خەلك هانئەدا. بەداخەوە هیچ شیعرێکی ئەو دەمەی بێکەسمان بەدەستەوە نییە کە لەو ڕۆژەدا لەناو کوڕی جەماوەرا خوێندبێتیەوەو ئاگری پێ بەردابێتە دلو دەروونیان. بەلام دیارە ئەبێ شیعری وای بووبێ. ئەگینا شاعیرێ کەلەپاش گرتنی بەبۆنەی ئەو ڕاپەڕینەوە لەناو قوولاییی بەندیخانەدا شیعری وەك(ئەی وەتەن)ەکەی بلێ، بە دلا ناچێ لەو ڕۆژەشدا چەند پارچەی ئاگرینی نەوتبێ.

بێکەس لەبنی چالی ڕەشەوە ڕاپەڕینی خەلك بە مژدەی بەختەوەریی دواڕۆژی گەل دائەنێ. ڕاستەوایە، چونکە بەختەوەری هەر لە تێکۆشان و کولۆلی هەر لە سەرشۆڕیدایە. مادەمیش خەلك هاتوونەتە کوڕی خەباتەوەو سەردەمی کڕوکپییان ناوەتە لاوە، دیارە ئیتر نۆبەی شادمانییە بۆ بێکەس و ئەبێ دوژمن بە داخی خەباتی خەلکەوە بتلێتەوە. بەرپەرچی ئەو بە دەم نیشتمان پەروەرانەش ئەداتەوە کە لە قسە بەولاوە هیچیان لەبارا نییەو بەراوردیان لەگەلێ ئەوانە ئەکا کە لە خوێنی خۆیانا ئەتلێنەوە کە دوژمن گلاندوونی و، پەیمانی خۆی تازە ئەکاتەوە بۆ گەل و نیشتمانەکەی کە هەر ڕۆلەکەی جارانیان بێو دیارە ئەو پەیمانەشی مەردانە بردەسەر و تا مرد نەیشکاند.

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە
وەختی بەندیبیو ئەسارەت، پێ بە تەوق و کوتەوە
من لەزیکرو فیکری تۆ غافل نەبووم، وا تێ نەگەی
حەپس و تێهەلدان و زیللەت تۆی لە بیر بردوتەوە
بەو خودایەی بێشەریك و لامەکان و واحیدە
عەشقی تۆ نەوعێ لە دلما ئاگری کردوتەوە
ئاگرێکیوا هەزار سال ئاوی بڕژێنیتە سەر
قەت گڕو کلپەو بلێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە
باسی مەحزوونیو کەساسیی خۆت نەکەی توخوا وەتەن
چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە

ماتەمینی تابە کەی، دەی پێکەنەو سەر هەلبڕە
موفتەخیر بە، شوهرەتت وا عالەمی گرتوتەوە
نەگبەتی لاچوو، سەعادەت بوتە پشتیوانی تۆ
کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە، ئەدرە وشێتەوە
گەرچی بەینێکە زەلیل و دیلی دەستی زالمی
نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحەزت لێك بێتەوە
لافیمیللیبیەت بە دەم لەم عەسرەدا کەلکی نییە
ڕۆژی هەولە، هەر بە هیممەت گۆی هونەر ئەبرێتەوە
بێقوسوورە، چەند جەسوورە صەد شوکر ئەولادەکەت
والە ڕێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە
بەسیە، تەعنەم لێ مەدە، هەر ڕۆلەکەی جارانتم
هێندە حیلمت بێ هەتاکو دەست و پێم ئەکرێتەوە
شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت کەم وەکوو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە

کە خەباتی گەلیش لە قوناغێکدا تێکئەشکێ و ئەو یەکێتییەی کە پێشتر لێشاوی گیانی شوڕشگێڕیی گەل لەناو هەموو چین و توێژەکانی کۆمەلدا دروستی کردبوو، ئەپسێو چینە سوودپەرستەکان پەردە لە ڕووی خۆیان دائەمالن و بێئەوەی شەرم و شکۆیەکیان لە ڕوودا بمێنێ، ئەچن پاکانە بۆ دوژمنی خوێن خۆری گەلەکەیان ئەکەن و چێکی نۆکەرایەتیی خۆیانی بە هەر دە پەنجە بۆ مۆرئەکەن و، تەنها ئەوانە لە کوڕی خەباتا ئەمێننەوە کە شتێکی ئەوتۆشك نابەن بە داگیرکەران و نۆکەرانی داگیرکەریانەوە ببەستێ و، پیرەمێردی نەمر بە پارچە شیعری(وەفدی کوردستان)ەکەی بەرەو باشوور بەڕێیان ئەکاو داخی ڕووزەردی و نەنگ و عار بە ناوچاوانیانەوە ئەنێ، بێکەسیش بەسەر پارچە شیعرەکەی پیرەمێرددا دێتەوەو ئەیکا بە خشتەکی.

کە بنیادەم ئەم پێنج خشتەکییە ئەخوێنێتەوە، هەست ئەکات چۆن بێکەسی نیشتمان پەروەری دلسۆز، هەروەك بلێسەی ئاگر، بە ڕووی ئەو خۆفرۆش و بێمیللەت و بێنیشتمانانەدا بەرز ئەبێتەوە کە هە موو مەبەستێکیان لە ژیانا هەر ئەوەیە هەلپەی سوودی تایبەتیی خۆیانیان بێو بازرگانی بە خوێنی هەزاران سەربازی نەناسراوی ڕێگای خەباتەوە بکەن کە لە پێناوی ئازادیی نیشتمان و بەختەوەریی گەلدا خوێنی خۆیان ئەکەنە سەر لەپی دەستیان، ئەو خۆفرۆشانەی کە قوربانیدانی تێکۆشەران ئەکەن بە پێپیلکە بۆ خۆیان تا بەسەر لاشەی قوربانییەکانی نەتەوەدا بڕۆن و بگەنە ئەو پایەو شوێنە دنیاییيە سووکەی ئەیانەوێ و هەرچی بیروباوەڕ و ئامانجی پیرۆز و داوای دوێنێیان هەبوە، هەمووی ئەخەنەلاوە.

بێکەس ئەلێ:

قەدری میللەتتان بە جارێ شکان
نە حەیاتان ما، نە ناوو نیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەر شان
"وەفدی کوردستان! میللەت فرۆشان!"
"هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان!"

بێکەس واتای شیعرەکانی پیرەمێرد لە چوارچێوەکەم دەرەتانەکەی ئەکاتە دەرەوە و، وەك هەر شۆڕشگێڕێکی ڕاستەقینە کە بزانێ چینە خوێن مژەکان هەرچی لافی نیشتمان پەروەری لێبدەن لەڕاستیدا بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ دەسخستنی سوودی تایبەتیی خۆیان خۆشبکەن، دێ ناوەڕۆکی چێنایەتیی خەباتی نەتەوەییمان بۆ دەرئەخاو لە دەلاقەی شیعرەوە ئەو ڕاستییەمان ئەخاتە بەرچاو کە مارکسیزم لێنینیزم زووتر دەری خستووە، ئەوەش ئەوەتە کە بۆرژوا لە بازاڕەوە فێری نیشتمان پەروەری ئەبێ و دیارە هەر بەهۆی بازاڕیشەوە لەبیری ئەچێتەوە:

حاجی! تووتنەکەت مادەم فرۆشرا
قیرووسیا لە صەد کوشتن و هەرا
دەخیلە هەستە، ڕێکەوە، خێرا
"دەسکێ لەو گولەی باغەکەی سەرا"
"کەوا بە خوێنی لاوان ئاودرا"
تاقمێ ڕێك خەن زۆر بە پڕلاقی
بە بەزم و ڕەزم و ئاهەنگ و ساقی
بۆ ئەوەی بکەن دەفعی مەراقی
"بیبەنە بەردەم عەرشی عێراقی"
"بلێن یار باقی و هەم صوحبەت باقی"

ئەنجا بە تەوسەوە بە شێوەی تانەو تەشەر، ئەوەی لە دلی ئەو خۆفرۆشتووانەدا هەیە کە ئەگەر بیانوێرایە بە خەلکەکەیان ئەوت، بۆمانی دەرئەخاو ئەلێ:

نە بارانتان دی، نە با، ئەی فەقیر

نە لاوان کوژران بە گوللەو شەستیر
نە پێی نازداران خرایە زنجیر
"پەردەو تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر"
"بڵێن دوای کوشتار هێشتا تۆی دڵگیر"

جابە زوبانی خۆی و خەڵکەوە دەنگ و هاواری ناڕەزایی هەڵئەبڕێ و، ئەڵێ:

هاوار بە ماڵم چیمان پێ کرا
لە چارەکێکا صەدمان لێ خرا
هێشتا خەڵاتیان ئەکەن بە بەرا
"دەك خەجاڵەت بن لە ڕۆی مەحشەرا"
"ئێمە خاك و خوێن ئەکەین بە سەرا"
"ئێوەش ئەو عەرشەی بە خوێن گوڵ ڕەنگە"
"سوجدەی بۆ ئەبەن هیچ ناڵێن نەنگە"

بەڵام لەگەڵ ئەو ئەنجامە ناخۆشەش کە بەزینی ڕاپەڕینەکەو خۆفرۆشتنی کۆمەڵێ لە سەرکردەکانی، لە دڵی جەماوەردا بەجێی هێشتبوو، بەتایبەتی لەو ڕۆژەدا کە هوشیاریی سیاسی هێشتا زۆر کزبوو، خەڵك لەوە نەئەگەیشتن کە تێکۆشانی سیاسی ڕەنگدانەوەی سوودە چینایەتی و کۆمەڵایەتی‌یەکانی کۆمەڵەو، میللەت وەنەبێ بریتی بێ لە تاقمێ سەرکردەو لە توێژەکانی سەرەوەی کۆڕو کۆمەڵە دەم هەراش و قسەزانەکان و شارەزاکانی کاروباری دنیا، تا ئەگەر ئەمانە خۆیان فرۆشت ئیتر هەمووشت بڕێتەوە، بەڵکو میللەت ئەم جەماوەرە بێشومارە ڕەشو ڕووتەیە کە سوودی هەرگیز لەگەڵ سوودی داگیرکەران یەکناگرێتەوە و قەت ناتوانن لەگەڵ یەك ئاشت ببنەوە.. هەروەها لەگەڵ ئەوەش کە دوژمن بە هەموو هێزو توانای، وەك هەمیشە هەر وائەکا، هەوڵی ئەدا گیانی ورەبەردان و بێباوەڕی و نائومێدی لەناو ڕەشە خەڵکەکەدا بڵاوبکاتەوە کە هێزی سەرەکیی خەباتن.. بەڵی لەگەڵ هەموو ئەوەش و بە پێچەوانەی هەموو ئەوەشەوە، بێکەس ڕاست ئەبێتەوە دارێك ئەدا بە لووتی ئەوانەدا کە دڵی خۆیان خۆش ئەکرد گوایە ئیتر ڕاپەڕینی میللەت بڕایەوە و تێکۆشان بەزیو جگە لەسەر شۆڕکردن بۆ داگیرکەر و مل بۆکەچکردنی هیچ شتێکی تر لەئارادا نەماوە. گوێ ڕاگرن بۆ بێکەسی نەبەز، بۆ بێکەسی دڵ بە باوەڕ ئاوەدان، بۆ بێکەسی بەرچاو ڕوون کە ئەڵێ:

قەت وا تێ‌مەگەن چاومان شکاوە
کوشتن و بڕین دائیم بۆ پیاوە
لەناو دۆشەکا کەی حەق سەنراوە
"خەیاڵتان خاوە کورد نەفەوتاوە"
"بەرای‌تی نەجات بە خوێن نووسراوە"
میللەت مەتینە عەزمی ناتەوێ
لە غایەی بەرزی خۆی هەر ناکەوێ
لەت وپەت کرێ حوقووقی ئەوێ
"من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ"
"مژدەی شەفەقی لێ دەرئەکەوێ"

لەم قۆناغە بەدواوە لەناو چینەکانی کۆمەڵەی کورددا ڕیزبەندییەکی نوێ لەڕووی کۆمەڵایەتی‌یەوە دەستئەکا بە پەیدا بوون. ماوەیەك دنیاکە چەشنە ئارامییەك ئەیگرێتەوە. ئەوە ماوەی ئاوسبوونی کۆمەڵەی عێراق و کوردەوارییشە بەو ڕووداوانەی لەوەلا دەستیان بەسەرهەڵبڕین کرد کە مێژووی ساڵەکانی سی پڕئەکەنەوە. هەر لەم ماوەیەدا بێکەسیش ئەکرێ بە مامۆستاو لە شار دوورئەخرێتەوە، بەڵام ئەو هەر لە تێکۆشانی خۆی ناکەوێ. هەرچەند لەو جەماوەرەشەوە دوور ئەبێ کە کاروباری نەتەوەیی بیبزوێنێ، لە ڕێگای دەرزی قوتابخانەوە کە بە قوتابییەکانی ئەڵێتەوە، تۆوی شۆڕش لە دڵی وەچەی نوێدا دائەچێنێ. سرروود و شیعری نیشتمان پەروەرییان بۆ ئەڵێ و پێیان لەبەرئەکا.

خەباتیش لە پێناوی خوێندەواریدا و لە دژی بیروباوەڕی کۆنی ڕزیو کە باڵی بەتایبەتی بەسەر لادێکاندا کێشابوو، مەیدانێکی گەورەی خەباتی ئەم ساڵانەی بێکەسە. میری بێکەسی بۆیە ناردبوە لادێ چونکە لە شارا بۆی قووت نەئەچوو. دیتی لە لادێیش هەر سەربزێوەکەی جارا نە.. ئەینێرێ بۆ حیللە، بۆ ئەوەی کەس نەبێ قسەی بۆ بکا، بەڵام چۆ ن کەس نییە؟ لە حیللەیش هەر میللەتێکی دەس بەسەرو ستەمدیدە و چەوساوە بووە، با بە زمانێکیکەش بدوێ بۆیە لە سەرەتای١٩٣٧دا لەسەر کاری لائەبەن. بێکەس لەم ساڵەوە تا ساڵی ١٩٤١ واتە تا ڕاپەڕینەکەی عێراق لە دژی ئینگلیز دوور لە قوتابخانەو قوتابییان ئەبێ، بەڵام لە١٩٤١دا ئەخرێتەوە سەرکار و ئەنێررێتەوە بۆ لادێ.

جووڵانەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی لەم ماوەیەدا هەر لە پتەوکردنی جێپێی خۆیدا ئەبێ. جووڵانەوەی ڕێکوپێکی چینایەتیشی دێتە پاڵ. ڕۆشنبیرانی تازە پێگەیشتوو کۆڕو کۆمەڵەو ڕێکخراوی نوێ پێکەوە ئەنێن.. دەنگی خەباتی گەلەکەی خۆیان لەگەڵ خەباتی گەلی عەرەب یەکئەخەن.. ئەنووسن.. گۆڤار و نامیلکە بڵاوئەکەنەوە.. بەڵام بێکەسی لادێنشین لێیانەوە دوورە و دەنگێکی کپیان نەبێ بە یەکتری ناگا.

شەڕ ئەبڕێتەوە.. فاشیزم فڕێ ئەدرێتە سەر سەلوێنکی مێژوو. جیهانی سۆشیالیزم تەوقی دەوری خۆی ئەشکێنێ و تیشکی ڕۆژی خۆی ئاراستەی سەروچاوی هەموو جیهان ئەکا.. عالەم هەموو بەهیوای جیهانێکی نوێ ئاواتی کۆن لە دڵو دەروونا تازە ئەکاتەوە.. مقۆ مقۆ پەیدا ئەبێتەوە کە ئەمجار وەك پاش جەنگی یەکەم نابێ و جارێکی تریش کورد بە گورگان خوارد نادرێ و شتێکی چنگ ئەکەوێ. بەڵام بێکەس، نازانم لە هوشیاری و تێگەیشتنی سەنگ و ترازووی هێزەکانی جیهانەوە بووە یا هەر لە ناهومێدییەکی پاشماوەی ناهومێدییەکانی پێشەوە، باوەڕی بەم قسانە هیچی نییە. ئەو لایوایە هەرچی ئەوتری هەمووی هیچ و پووچەو ماف هەرگیز نەدراوە، ستێنراوە. گەلیش کە نەزان و نەخوێندەوار بوو و چاکەو خراپەی خۆی نەزانی هەر ئەوەی بەنسیب ئەبێ کە دیلی دەستی بێگانە بێ:

دەنگ بڵاوەو خەڵق ئەڵێن ئەمجارە کورد سەربەست ئەبێ
چی ئەڵێن، بیڵێن، لەلام وایە درۆو چاوبەست ئەبێ
صەد هەزار جارمان سیاسەت تەجروبە کردو کەچی
ئێستەکەش زۆرمان بە فیشاڵی وەها سەرمەست ئە بێ
کەی حوقووق ئەدرێ؟ ئەسەنرێ. عەیبە ئیتر تێ‌بگەن

**سەربەخۆیی چۆن نسیبی قەومی وا بێدەست ئەبێ**
**میللەتی جاهیل لە دنیادا ئەبێ هەر بەندە بێ**
**نۆکەری هەر خشت بە باڵای قەومی دیل و پەست ئەبێ**

لەگەڵ هەندێ سەری نیوە و ناتەواو ڕاستی بیری ئەم شیعرەشدا، لە سەرێکی کەشەوە بۆنێکی خەستی نائومێدیشی لێنەکرێ. ڕاستەکەی بێکەس سەروەڕ لە حاڵەتی پەشێوی و دڵەکوتەو پەرێشانیی دەروونیدا بووە. لەبەرئەوە کە نیشتمان پەروەری و نەتەوە دۆستییەکەی -ئەگەر ڕاستبێ بڵێین- شتێکبووە لە ناخی خۆیدا و لەسەر بناغەی هوشیارییەکی زانستانە نەبوە، گەلێ ڕووداوی ڕۆژانە بە چاك یا بە خراپ کاری تێکردووە. لە توێکانی ناوەوەی دەروونیدا، وەك تێکۆشەرێکی هەمیشە سەربەرز، هێزێك بوە پاڵی پێوە ناوە هەردەم شیعری شانازی بە تێکۆشان، بەقارەمانەتی، بەورە بەرنەدانەوە بڵێ.. بەگژی دەردە کومەڵایەتییەکاندا بچێ.. پەردە لە ڕووی توێژە دەسڕو ساختەچییەکانی کۆمەڵ هەڵماڵێ. نەدیتنی ئاسۆی ڕوونی دواڕۆژیش گەلێ جار شیعری نائومێدانەی پێ بنووسێ. هەرچەند بە خەیاڵی خۆی بەڵگەی زانستانە بۆ ئەو نائومێدییەشی ئەدۆزێتەوە، بەڵام چونکە هۆی ڕاستەقینەی ئەو ناتەواوییانە نازانێ کە گیانی نائومێدییەکەی تیا ئەبزوێننەوە، ناتوانێ ئەنجامی دروستیش لە زانستەکانی خۆی وەرگرێ، وەك لەم پارچە شیعرەیدا کە ئەڵێ:

**کورد ئەبەد ناگاتە مەقصەد، نۆکەری بێگانەیە**
**دوودڵن، پیسن لەگەڵ یەك، بۆیە وا بێ‌لانەیە**
**میللەتێکن بۆ نەمانی یەکتری هەر هەوڵ ئەدەن**
**داخەکەم وردو درشتی شێت و شەیدای ئانەیە**
**سەنعەت و عیلم و مەعاریف زەڕڕەیەك باوی نی‌یە**
**پیاوەتی لایان بەتەنها چەفتەوو جامانەیە**
**بۆ قسەی زل بێ‌قوسوورن، باسی کوردییەت ئەکەن**
**کوردییەت خورمایە بۆچی، یا قسەی شێتانەیە**
**میللە تی بێ‌عیلم و ئەخلاق چۆن بە ئیستیقلال ئەگا**
**واسیتەی بەرزی‌و تەرەققی هیممەتی مەردانەیە**

زۆرجاریش کە ئەبینێ شیعروتن دەرمانی دەردی بۆ ناکاو هیچی بۆ ناگۆڕێو جیهانی ناپەسەند خۆی لە بەرچاوی وناناکا، ئەیەوێ ئەم خۆی لە بەرچاوی ئەو ونکاو بۆ ئەو مەبەستە پەنا ئەباتە بەر خواردنەوەو لەو تاوە ڕەش و تاریکانەی ژیانیدا پێکەکەی ئەبێ بە فریادڕەسی.

لە مەیدانی باسی نیشتمان پەروەری و ئازایی و بەجەرگیی بێکەسدا پێویست بە هێنانەوە یادی پارچە شیعری(بیست و حەوت ساڵە...) نییە چونکە ڕاستەکەی لە یادی زۆربەی خوێندەوارانی شیعریدایە. ئەوەندە بەسە کە بڵێین ئەم پارچە شیعرە کە لە سەردەمی بوونی کۆمەڵەی مەهاباد و بۆ کاربەدەستێکی گەورەی ئیمپریالیزمی ئینگلیز وتراوە، بانگەوازی ئیفلاسی ئەو بووچوونە چەوتەیە کە تا ئەوکاتەو بەڵکو هێشتا ئێستاش توێژێکی کەم نای کۆمەڵەی کوردەواری باوەڕیان پێ بووەو بە ڕاستەقینەی یەکەمی ژیانیان زانیوە کە ئەویش ئەوەتە: کورد خۆی هیچی پێناکرێ و ئەبێ ئینگلیز و ئەمەریکا شتێکی بۆ بکەن. بێکەس بەئاشکرا لەم پارچە شیعرەیدا هەموو فیشاڵ و گفتو دڕۆی ئیمپریالیزمی ئینگلیز کە ئەوکاتە هەر خۆی بەناوبانگ بوو هێشتا ئەمەریکا جێی نەگرتبووەوە، ئەداتەوە بە ڕووی نوێنەرەکەیداو جاڕی ڕزگاربوونی بیری خۆی لە داوی ئەو ئەداو، مژدەی گرتنەبەری ڕێگای ڕاست، ڕێگای ناسینەوەی دۆست و دوژمنی ڕاستەقینە بڵاوئەکاتەوە. بۆیە لە خۆڕایی نییە لە مێژووی ئەدەبی سیاسیی کورددا ئەم پارچە شیعرە بە یەکێ لە نموونە باڵاکانی بەرەنگاربوونی دوژمن و نیشانە دیارییەکانی هوشیاریی سیاسی دانراوە.

بەرلەوەی لە لێکدانەوەی ڕووی سیاسیی شیعری بێکەس ببمەوە، ئەمەوێ نموونەیەکی گەشی گیانی شۆڕشگێڕانەی ئەو شاعیرە تێکۆشەرە بخەمە بەرچاو کە پڕە لە شانازی کردن بە قوربانی دانەکانی گەل و ڕۆڵە دڵسۆزەکانیەوە... لە متمانە بە دواڕۆژی گەل... لە دەستەو دامێن بوونی لاوان بۆ بەتین کردنی خەبات.. لە دەستەویەخە وەستان لەگەڵ ئەوانەی کە خەمی وڵات و گەلیان لە دڵدا نییەو هەر لە سوودی خۆیان ئەگەڕێن... ئەوەش ئەو پارچە شیعرەیەتی کە بەبۆنەی هێنانەوەی تەرمی چوار ئەفسەرەکەوە نووسیویەتی کە بۆ تۆڵەسەندنەوە لە بەشداربوونیان لە شۆڕشی ١٩٤٥ی کوردی عێراق و ڕۆیشتنیان بۆ ناو کۆمەڵەی مەهاباد، لە١٩ی حوزەیرانی١٩٤٧دا لە بەغدا کران بەدارا. بێکەس ئەم پارچە شیعرە بەسۆزەی لە پێشوازی لێکردنی تەرمی ئەو شەهیدانەدا وتووە کە دوانیان هێنرابوونەوە بۆ سولەیمانی بێکەس لەم پارچە شیعرەیدا ئەڵێ:

**قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر ڕووی زەمین**
**میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین**
**میللەتێ لاوی لە ڕێگەی سەربەخۆیی نیشتمان**
**بێتە بەر سێدارە، بێ‌ترس، دەم بە خەندەو پێکەنین**
**قەومی‌وا نامرێ، ئەژی، با دوژمنی هەر شەق بەرێ**
**ساحێبی ڕۆڵەی نەبەردە، خاوەنی عەزمی مەتین**
**ئەوکەسەی گیانی لە ڕێگەی نیشتمانا بەخت ئەکا**
**پێی مەڵێن مردوو، شەهیدە، واڵە فیردەوسی بەرین**
**لا وی کورد مەردە، لە مردن قەتعییەن باکی نی‌یە**
**پەندی پێشینانە، ڕاستە"بەرخی نێر بۆ سەربڕین"**
**وا وەتەن دیسان بە مەحزوونی ئەڵێ: ئەی لاوەکان**
**بۆچی وا مات و مەلوولن، بەسیەتی شین و گرین!**
**ڕۆژی تێکۆشانە، سادەی هیممەتێ تاکو زووە**
**بەشکو لەم حاڵە نەجاتمان بێ‌و لە دیلی دەربچین!**
**گەرچی هەندێ کەس خەریکن ورگ و گیرفان پڕئەکەن**
**شەو بە بێ‌خەم سەر ئەنێنە سەر سەرین، هەر سەرسەرین**
**پیا و ئەبێ دائیم خەمی قەوم و وڵاتی خۆی هەبێ**
**ئەوکەسانەی بێ‌خەمن حاشا نەوەی ئەم خاکە نین**

لە دواساڵەکانی ژیانی بێکەسدا بوو قەڵەمبازەکەی کانوونی دووهەمی١٩٤٨ ڕوویدا. قەڵەمبازی کانوونی دووهەمی١٩٤٨ کارێکی ئێجگار گەورەی کردە بەشێکی زۆری خەڵکی عێراق، چ ئەوانەی لە سیاسەتدا بوون و چ ئەوانەی لێی دوور بوون. توانینی بەزاندنی ئیمپریالیزمی ئینگلیزو نۆکەرە حوکمڕانەکانی و هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی(پۆرت سماوس) و داسەپاندنی ئازادییە دیموکراتیەکان بابۆ ماوەیەکیش بووبێ و، هاوکاریی گەرم

و گوڕی کورد و عەرەب و لێکئالآنی ئەلقەکانی خەباتی هەردوو گەل و، بەشداری کردنی چالاکانەی ژنان لە خەباتداو وریابوونەوەی کۆمەلآنی خەلك لە ئاست فێلْ و تەلْەکەی جۆربەجۆری ئیمپریالیستەکان، ئەمانە هەموو بەرهەمی قەلْەمبازی١٩٤٨ن. بەلآم بەشبەحالْی شاعیرێکی نەتەوەپەرستی وەك بێکەس کە پێشتر بیرێکی ڕۆشنی لەمەڕ برایەتیی کورد و عەرەب و خەباتی پێکەوەی هەردوولایانەوە لێ دەرنەکەوتووە، پەیدابوونی ئەم بیرە گەورەترین ئەنجامی ئەو قەلْەمبازەیە. شایانی وتنە ئەم قەلْەمبازە هەمان کاری لە پیرەمێردیشدا کردووە کە ئەویش لەگەلْ ڕووی هوشیارتر بوونی سیاسیی خۆیەوە قەرزاری ئەم قەلْەمبازەیە.

کاری قەلْەمبازی١٩٤٨ لە بێکەسی نەمردا لە پارچە شیعری(داری ئازادی)یەوە دەرئەکەوێ کە لە بیری خەلْکدا بووە بە یەکێك لە پارچە شیعرە پڕسۆزە بەشۆڕەتەکانی خەبات:

**داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ**
**سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەر ناگرێ**
**پیاو ئەبێ بۆ سەندنی حەققی لە مردن سلْ نەکا**
**هەر(بڕووخێ) بەس نی‌یە، تاکوو نەسەنرێ، نادرێ**
**کورد ئەگەرچی موددەتێکە دیل و داماوە، بەلآم**
**باوەڕت بێ ڕۆحی میللی هەر ئەمێنێ، نامرێ**
**تۆ ئەگەر ئیسلآحی قەوم و نیشتمانی خۆت ئەوێ**
**لێت موحەققەق بێ بە بێ شۆڕش مەحالْە ناکرێ**
**بیری ئازادی جیهانی گرتەوە، توخوا بەسە**
**ئەم نیزامە کۆنە تاکەی؟ هیممەتێ کەن لابرێ**
**قەت مەلْێن دوژمن بەهێزە، تۆپ و تەیارەی هەیە**
**ئیتتیفاقتان گەر هەبێ زۆر زەحمەتە خۆی ڕاگرێ**
**ئەم عێراقە خۆشەویستە خاکی گولْ گوون بوو بەخوێن**
**تاحەقی دەسگیر نەبێ لەو خوێنە دەس هەلْناگرێ**
**نێرو مێ هەردوو بە جووتە بۆ وەتەن هەولْێ نەدەن**
**دوورە دەرچوونی لە دیلی، مەل بە بالْێ نافڕێ**
**هەولْی ڕاستی هەردولا ئامانجی میللەت سەرئەخا**
**چونکە مەعلوومە بە یەك دەس چەپلْە قەت لێ نادرێ**
**وا گلۆلْەی کەوتە لێژی، باوی ئیستیعمار نەما**
**هیچ کەسێ ئیتر بە زوڕناو تەپلْی ئەو هەلْ ناپەڕێ**
**دۆستیی کوردو عەرەب زۆر کۆنە، تەئریخ شاهیدە**
**ناحەزی ڕووڕەش لەداخا با یەخەی خۆی دادڕێ**

لەم شیعرەوە بە خەستی هەست بەو کارە ئەکەین کە قەلْەمبازی کانوونی دووهەمی١٩٤٨ لە دەروونی ئەم خەلْکەداو لە ناو ئەوانیشا لە دەروونی ڕۆشنبیرانی وەك بێکەسدا کردبووی. بەجۆرێ متمانەی بە ئەنجام بەخشینی خەبات پێ پەیدا کردبوون، تەنانەت بکەونە زیادەڕەوی و هەلْەیشەوە تیایدا، ئەگینا پاش١٩٤٨و تائێستاش هەموو لێرەو لەوێو لەگەلْ شوێنی تردا بە چاوی خۆمان دیمان گلۆلْەی ئیستیعمار بەجۆرێکوا نەکەوتبووە لێژی باوی نەمێنێ و لە زۆر لای عێراق و شوێنانی تراکۆڕو کۆمەلْەو دەستەی زۆر هەبوون و هەن بە زوڕناو تەپلْی هەلْپەڕن و مەرامەکانی بەجێ بێنن و ببنە پردەباز بۆ هێنانەدیی ئاواتە چەپەلْەکانی. بەلآم دیارە ئەمڕۆ بێو سبەی بێ لافاوی هوشیاری و بیرکردنەوەی ڕاست پاشماوەی ئەم دیاردەیەش ڕانەمالْێ و جیهانێکی وا دێتە پێشەوە ناوی ئیمپریالیزمی تەنها لە لاپەڕەی مێژوودا تیا بمێنێتەوە و گەلان، وردودرشت و گەورە و بچووکیان، بە وەرگرتنی مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆیان بەختەوەر بن.

بێکەس کۆمەلْێکی زۆر شیعری کۆمەلآیەتیشی هەیە. لەو شیعرانەیدا ڕەخنە لەگەلْ ڕووی ژیانی کۆمەلآیەتیمان ئەگرێ. کە ئەلْێم ژیانی کۆمەلآیەتی مەبەستم واتا فراوانەکەی وشەکەیە کە کەلتوور و ئایین و داب و نەرێت و خووڕەوشت و گەلْ بابەتی تریش ئەگرێتەوە. جارجاریش لەم چەشنە شیعرانەیدا ئەوەندە ڕەشبینە، وەك بلْێی ترووسکەی چاکەی لەم جیهانەدا بەرچاو ناکەوێ.

هەموومان ئەزانین کۆمەلْێ لەسەر بناغەی سوودی تایبەتی بەڕێوەبچێ هەموو ئەو بەها کۆمەلآیەتیانەی تیا ئەخرێتە ژێر پێوە کە خەلْکەکە خۆیان لە سەرێکیترەوە بە شان و بالْیدا هەلْئەدەن و گۆرانیی بۆ ئەلْێن. ئەم ڕاستییە زۆرجار وا لە گەلْ کەس ئەکا متمانەیان بە کەسیتر نەمێنێ و خەلْك هەموو بە گورگ بزانن. لەگەلْ ئەوەشدا کە هەموو ئەزانین ئەمە ڕاست نییە و دنیا هەمیشە وەك خراپی تیا بووە و تیایە، چاکیشی تیا بوە و تیایە، زۆرجار بە زیادەڕەوی ئەم رووەکەی مەسەلەکە لە بەرچاوی خۆمان ونئەکەین و تەنها ڕووە ڕەش و دێزەکەی ئەبینین، ئەی خۆمان بپرسین ئەگەر ڕاستە دنیا بەم جورەیە کە ئێمە ئەیلْێین، ئەی خۆمان لەم ناوەڕاستەدا ئەبێ چیببینو لە چ بەرەیەك بین؟ کەس بەشبەحالْی خۆی بیر لەم پرسیارە ناکاتەوە.

بێکەسیش یەکێکە لەوانەی کە تاقیکردنەوەی تالْ و سوێری ژیان و هاوڕێی بەدو بەدەنگەوە نەهاتنی کۆمەلْ لە ڕۆژەکانی تەنگو چەلْەمەیدا، کە ئەوەش بە نیسبەت کەسانی خاوەن هوشیاریی کۆمەلآیەتی‌یەوە هەرگیز بە شتێکی سەیرو لە قانوونەکانی سروشت بەدەر دانانرێ، کارێکی خراپیان کردووەتە سەر جۆری بیرکردنەوەی و لە هەندێ پارچە شیعریدا ئەو بۆچوونانەی خۆی وەکو ڕاستیەکی ژیان لە قەلْەمداوە و پێشکەشی خەلْکیشی کردوون، کە ئێستاش لەوانەیە دەورێکی نادروست لە پەروەردەکردنی خەلْك و داڕشتنی بیریاندا ببینن، وەك ئەم شیعرانەی کە تیایاندا ئەلْێ:

**سەرم سووڕماوە نازانم چ شەخسێ بێ غەش و چاکە!**
**لەناو ئەم قەومەدا کێ‌یە لەگەلْ هاوجینسی خۆی پاکە!**
**لەلام وا باشە ئێستاکە بە کەس پشتێ نەبەستی تۆ**
**لە خزم و دۆست و ئاشنایان هەتا ئەتوانی هەر ڕاکە**
**کەس و کارت وەکوو مارن، ئومێدت هیچ نەبێ پێیان**
**لەژێر سایەی ئەوان دەرچۆ، برادەر، خۆتی لێ لاکە**

دیارە ئەم بیرە هەلْەیە ئەنجامی بۆچوونێکی نادروسێ تێگەیشتنی مەعنای ئەو ڕاستی‌یەیە کە هەر لەم پارچە شیعرەیدا لە بەیتێکی تریدا دووبادی ئەکاتەوە کە ئەلْێ:

**ئەگەر پارەت نەبێ بەخودا هەزار خزمت ببێ پەشمە**
**کە پارەت بوو هەموو عالەم براتەو پێت ئەلْێ کاکە**

بەلآم ئەبێ ئەوەش بلْێین کە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بیرکردنەوەی هەمیشەو سەرەمڕی بێکەس نییە. بێکەسیش وەك

هەر کەسێکیتر بنیادەمێکە لە گۆشت و خوێن و هەست پێکهاتووە. جاری تەبیعی و جاری ناتەبیعییشی هەیە.

تووڕەیی و ڕووخۆشی، شەڕو ئاشتی، ترشی و شیرینیی لە ژیانی خۆیا بینیوەو ئەبینێ و، لە هەردەمێکدا باری ژیانی بەجۆرێ کار ئەکاتە سەربیرکردنەوەی. ئەوە هەر تەنیا کەسانی بەڕاستی هوشیارن، ئاگاداریی خۆیان ئەکەن هەڵنەچن و حوکمی وانەدەن کە بەرهەمی بارێکی ئێجگار تایبەتی و کاتێکی زۆر تایبەتی و زوو بەسەرچووبێ.

کۆمەڵەی کوردەواری لە سەردەمی بێکەسدا هەرچەند پێیشی نابوە قۆناغی سەرمایەدارییەوەو چینی کرێکاریشی تێدا پەیدا بووبوو و قەوارەو تاپۆیەکی تاڕادەیەك پێگەیشتووی هەبوو، بەڵام هێشتا لەبارەی جۆری بیرکردنەوەوە لە دوای دەرەبەگی ڕزگاری نەبووبوو. خاسیەتێکی بیری دەرەبەگی نووسانە بە دابو نەریتی کۆنەوە و لاتەدانە لێیو فیزو خۆڵ بایی بوونێکی بێبنچینەو بناغەی ڕاستەقینەیەو کەللەرەقییە لە ئاست گۆڕانە ڕاستەقینەکانی ژیاندا. بێکەس لە پارچە شیعری(عەیبە.. عەیبە)دا ڕەخنە لە ڕەوشتێکی کۆمەڵی دەرەبەگی ئەگرێ کە ئەوەتە مرۆڤ لەبەر شەرمی دەسبەرداربوون لە داب و نەریتی کۆن خۆی تووشی هەزار جۆرەدەردو مەینەت ئەکا. ئەگەر ڕەخنەگرتن بووایە بە مایەی چەند وەرگرتنی ڕەخنە لێگیراوەکە، ئەبوو ئەم کۆمەڵە دەرزێکی ئەوتۆی لەو پارچە شیعرەی بێکەس وەربگرتایە بەشی ئەوە بکا بیگێڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست، بەڵام لەم ژیانەدا تەنها هەر ژیان ئەتوانێ دەرزی خەڵك دابداو ناچاری گۆڕینی سروشتیان بکاو لەوە بەولا وە چارەیەکیتر نییە.

جاریوایش هەیە بێکەس هەست بە ناکۆکییەکانی ژیان ئەکاو دەریان ئەبڕێ، بەڵام چاریانی بۆ نادۆزرێتەوە، چونکە ئاستی پێشکەوتوویی کۆمەڵەکەی ڕێگای ئەوەی نادا. لە پارچە شیعرێکا کە ڕەخنەی تیا لە بوونی تیپێکی دانس ئەگرێ لە سولەیمانی، ڕووە خراپەکانی بوونی ئەوتیپە دەرئەبڕێ کە ئەوەتە بووە بەهۆی لات کەوتنی خەڵك و ماڵبەجێهێشتنی پیاوان.. لەولایتریشەوە کە تیپەکە ئەڕواو هەموو شتێ ئەگەڕێتەوە دۆخی جارانی، لە پارچە شیعرێکی تریدا بێزاری لەوە دەرئەبڕێ کە هەر دنیا تاریك داهات شار چۆڵ و خامۆش ئەبێو، هەرکەس ئەبێ بچێتەوە بۆ ماڵ و ئەگەر ماوەیەکیش بە گفتوگۆیەك شتێکەوە خەریکبن، ئەبێ ئیتر خۆیان بکەن بە ژێر لێفەدا. هەندێکیش کە پارەداران، بۆ بەسەربردنی کاتیان دەسئەکەن بە قومارکردن و لەم ڕێگایەوە ماڵیان وێران ئەبێ و قوڕ ئەکرێ بەسەریاندا.

دیارە ئەم دوو سەرەی بوون و نەبوونی تیپی دانسەکە هەردووکیان ڕاستن ئەم ناکۆکییەی بێکەس بەدەستیەوە داماوە، تەنها ژیانی شارستانەتیی پێشکەوتوو ئەتوانێ چاری بکا، ئەویش لە ڕێگای فرەکردنی شوێنی ڕابواردن و گەشەپێدانی گیان و دەروونەوە وەك شانۆو کولووبی مۆسیقاو یانەی کولتوور و سینەمای پیشاندەری فیلمی بەسوود و پەروەردەکەر و شتیوا، وەك لە ژیانی شارانی پێشکەوتووی جیهانا ئەبیینین. بەڵام وەك دیارە بێکەسی دنیا نەدیو ناتوانێ ئەمە بزانێ و لەگەڵ گلەییەکەیدا لە هاتن و لە چوونی تیپی دانسەکە دروشمی ڕاستیش هەڵبگرێ و ڕێگای چارەی دەردە کۆمەڵایەتییەکە پیشان بدا.

بێکەس عەودالی دوای کارو هەوڵو تەقەلاو ڕەنجدانە کە ببێ بە ڕەوشتی هەموو ئەندامانی کۆمەڵ.. خەڵك بانگ ئەکا بە بەڵگە بۆ قسەکانی... میسالی لەبەرچاو بۆ خەڵك دێنێتەوە.. ناپەسەندیی کارنەکردنیان ئەخاتە بەرچاو.. ئەمە هەمووی لەوەوەیە کە هەموو ڕۆژێ پۆل پۆل خەڵکی بێکاری دیوە یا لە مزگەوت و تەکیەو خانەقاکاندا بە ناوی خواپەرستییەوە پاڵیان لێداوەتەوە، یا لەناو کۆڵان و بازاڕا خەریکی سواڵکردنبوون، بەڵام دیسان بەداخەوە لەبەرئەوە کە دەرفەتی تێگەیشتنی ڕاستەقینەی نهێنییەکانی دەردی بێکاریی نەبوە و نازانێ خەڵك بۆ بێکار ئەسووڕێنەوە و بۆچی بۆ ژیانیان پشت بە ڕێگای نادروست ئەبەستن، لایوایە ئەم خەڵکە بێکارە هەر بەئارەزوو ڕێگای بێکاری ئەگرنەبەرو تاقەتی کاریان نییە... ئەو ناتوانێ بنەما ئابووری و بیرییەکانی بێکاری دەستنیشان بکات، لەبەرئەوە هەر هاوار و دادێ کە بۆ کارکردنی ئەکا لەوەئەچێ لە دۆڵێکی قووڵا هاوار بکاو، ئەنجامێکی ئەوتۆ لە ژیانی کۆمەڵدا بەجێناهێڵێ.

بێکەس تەقەلای ئەوەشی هەیە کە هۆیەکانی دواکەوتنی گەلەکەی بەو سروشتە بەدانەدا بدۆزێتەوە کە لەناو کۆمەڵ و چین و توێژەکانی کۆمەڵدا بوون لەمەوە ئەکاتە ئەو ئەنجامە کە هەرچیمان بەسەردێ ئەنجامی کاری خۆمانە بێگومان ئەم جۆرە لێکدانەوەیە کە تاڕادەیەك یەکسەرەو بەشێوەیەکی میکانیکییە، ئەگەر لە بەستنەوەی ئەنجامیشدا بە هەندێ هۆوە بەهەڵەدا بچێ، ڕوویەکی دروست و یەجگار ڕاست و بایەخداریشی هەیە کە ئەوەتە چارکردنی دەردی هەر کۆمەڵێك بەر لە هەرچی لە دەستی کۆمەڵەکە خۆیدایەتی. نموونەی ئەم چەشنە بیرکردنەوەیەی بێکەس لە پارچە شیعری(خوا کێو نەبینێ، بەفری تێناکا)دا بەئاشکرا دیارە کە ئەمە چەند کۆپلەیەکیەتی:

ئەگەرچی ئێمە قەومێکی زۆرین،
بەڵام داخەکەم جووت و خۆخۆرین
بۆیە وا لەژێر چەپۆك و زۆرین
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێناکا

- - -

بۆ کوشتنی یەك گورج و بەکارین
ڕۆژێ دەستمان بێ بلح و زۆردارین
لە پێویستیدا وەك ژن هەژارین
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا

تا کێو نەبینێ بەفری تێناکا

\- - -

مونەووەر زۆری هەر لەبەر نانی
وەتەن ئەفرۆشێ بەیەك تارانی
ئەخاتە ژێر پێ دین و ئیمانی
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تاکێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

\- - -

ئەشرافمان هەموو بێڕۆح و سستن
دەخیلە پشتیان هیچ پێ مەبەستن
هەموو ناکوك و پارە پەرستن
کاکە خوا ئیشی نابەجێ ناکا
تا کێو نەبینێ بەفری تێ ناکا

\- -

بێکەس لایەنگری ئازادیی ئافرەت و خوێندن و کارکردنیەتی.دژی سەرپۆش و اباو پەچەو چارشێوە... هەروا دژی خۆ خەریك کردنیەتی بە ئارایشت و خۆڕازاندنەوەوە. بێکەس بە ئافرەت ئەڵێ جوانیی تۆڵە زانست و فێربوون و هاوچەرخایەتیدایە. ژن و پیاو تێکڕا بە دوو قوڵی تەواوکەری کۆمەڵ دائەنێ. ئەمە بەئاشکرا لە پارچە شیعری(نەسرین)دا دەرئەکەوێ، وەك لە پارچە شیعری(داری ئازادی)یشدا دەرکەوت.

بێکەس لە پارچە شیعری(نەسرین) دا ئەڵێ:

نەسرین! دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی، ژیانت زوڵمە
وامن پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە، چ وادەی شەرمە

\- - -

ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانە
عالەم شەوو ڕۆژ وا لە فرمانە
فەرقی نێرو مێ نیيە بیزانە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە

\- - -

مەڵێ من کچم، تۆش وەکوو منی
موحتاجی عیلم و فەن،و خوێندنی
مەجبووری ئیش و خزمەت کردنی
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە، چ وادەی شەرمە

\- - -

هێندە دانیشتی پشتت چەماوە
زەردو لاواز بوویت هێزت نەماوە
کچی بێگانەت خۆڵە بەرچاوە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە، چ وادەی شەرمە

\- - -

خشڵ و جوانیی تۆ حەیاو فێربوونە
پاشەڕۆژیشت هەر بەوان ڕوونە
کچی بێعیلم دیل و زەبوونە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە، چ وادەی شەرمە

\- - -

وەك خوشك و برا ئەبێ هەردوکمان
قۆڵی لێ هەڵکەین بچینە مەیدان
تا کورد بەرینە ڕیزی میللەتان
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێدە، چ وادەی شەرمە

بێکەس دوژمنی باوك کوشتەی شێخیەتی و پڕوپووچی شێخە کان و ئەو ئەفسانە بەناو ئاییینیيانەیە کە مەلایانی پاشکەوتوو بەناو خەڵکدا بڵاویان ئەکەنەوەو ئەم ڕەشە خەڵکە بەسەزمانەی پێ لە خشتە ئەبەن. لە شیعرەکانیا دژی کوڕی دەفلێدان و چەقۆ بەخۆدا کردن و هەڵخستنەوەی دەروێشانەو بەپێچەوانەی موسوڵمانەتیی ڕاستەقینەی دائەنێ... دژی ئەو بیرە کۆن و ڕزیوانەیە کە کۆمەڵێکی زۆر لە مەلایان بە خەڵکیاندا ڕائەگەیەنن و کۆمەڵەیان لە ژیانی نوێ پێ دوور ئەخەنەوە... دژی شێوەی پاشکەوتووی لە سەدەکانی ناوەڕاست بەجێماوی خوێندنی فەقێ و دژی شێوەی ژیانیانە. بەراوردی ژیانی وڵاتانی ئیسلام و ئەورووپا ئەکا کە ئەورووپا ڕێگای زانست و هونەری گرتووتەبەر و وا پێشکەوتووە کە هەموومان چاو لەدەستینیو، وڵاتانی ئیسلامیش لەبەر مانەوەیان لەسەر ڕێو شوێنی سەردەم بەسەرچوو هەروا بە پاشکەوتوویی ماونەتەوە. ئەم بیرانەی بێکەس لە پارچە شیعری(ئەی مەلا) و(مەلا و شێخەکان)دا بە ئاشکرا دیارە. والە پارچە شیعری(ئەی مەلا) ئەم کۆپلەیە هەڵئەبژێرین و ئەی کەین بە نموونە:

هەردو گوێم پڕ بوو لە باسی وەعز و سەرفیترەو زەکات
هەر هەواڵی حەشرو نەشرم پێئەڵێن تاکو مەمات
بەسیە لەم مەوزووعە لادە، فێری نوێژ بوو کائینات
ئەی مەلا تۆبی خودا لەم فیکرە کۆنە لابدە
فەننی تازەم پێ نیشاندە بۆ تەرەققیی کائینات
خوایە! یەك(لووپەر) بنێری بۆ گەلی کوردی فەقیر
تا نەجاتی بێ لە ژێردەستیی مەلاو شێخان و پیر

لە پارچە شیعری(مەلاو شێخەکان)یش ئەم دوو کۆپلەیە ئەخەینە بەرچاو:

مامە سۆفییش وای تەمایە هەر بە ڕیشی پانەوە
قەسری بۆ حازر کرابێ پڕ بە حۆریی جوانەوە
ئەو ئەڵێ جەننەت بە ڕیشە چیی بەسەر عیرفانەوە
سەد سەلاحەددین و دارا قیمەتی یەك ئانەیە

\- - -

چاوەکەم بەخوا خەیاڵتان خاوە چاکی تێبگەن
خوا یەکێکی خۆش ئەوێ دانا بێ خاوەن عیلم و فەن
کەڵکی بۆ خۆیو بەشەر بێ، خادیمی ڕاستی وەتەن
هایو هوویی بێسەمەر هەر کردەوەی شێتانەیە

بێکەس لە مەیدانی نووسینی ئەدەبی منالانیشدا ئەبێ بە پێشەنگ دابنرێ ئەو سەرەڕای ئەو هەموو سروودە نیشتمانی و کۆمەلایەتی و پەروەردەیيەی بۆی نووسین و لە قوتابخانەکاندا پێیوتوون، کۆمەڵێ شیعری منالانیشی هەیە هەر بە ئامانجی پەروەردەکردن و ڕێگای پیشاندان لە ژیاندا بۆی داناون. بۆیە ڕۆژێ لە ڕۆژان کە مێژووی ئەدەبی منالان لە زمانی کوردیدا ئەنووسرێ، بێکەس لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانەوە ئەبێ کە جێگای شایانی خۆیان لەو مێژووەدا وەرئەگرن.

پێشتر لە پەراوێزی شیعرێکیدا کەمێك باسی ئەو گیانی نائومێدی و ڕەشبینیەمان کرد کە لە هەندێ پارچەی شیعری بێکەسدا دەرئەکەوێ. ڕاستەکەی ئەم گیانی نائومێدییە هەرچەند لە کەم پارچە شیعری بێکەشدا خۆی دەرئەخا چونکە بێکەس خەباتکەرو ڕۆڵەی گەلەکەی بووەو خەبات و خزمەتی گەلیش هەرگیز لەگەڵ بە ڕێبازکردنی ڕەشبینی و بلاوکردنەوەی گیانی نائومێدی یەکناگرنەوە، بەلام من وای بۆ ئەچم لە ناخیا چەکەرەیەکی هەرگیز نەمردووی ئەم گیانە بووە. کەسێك بە منالی

لەگەڵ دایکیا بکەوێتە نامۆیی، برای لە ئاوی دیجلەدا بخنکێ، باوکی بەهۆی کارەساتی جەنگەوە بکەوێتە تورکیاو ئیتر بڕای بڕ لەگەڵ منداڵەکانی یەکتری نەبیننەوە.. سەرەتای منالیی، بە خۆشیی ژیانی منالی کاربەدەستێکی سوپای میری بەسەربردبێ، کەچی لە ساڵە قاتییەکانی جەنگدا لەگەڵ دایکێکی غەریب کەوتووی شاران لە ماڵی کابرایەکی بێگانەدا بژی لە بەغدا.. هەر بە منالی لە نیعمەتی چاوێکی بێبەش بووبێ و سەرەڕای ئەوە ئاوڵەش سەرو سیمای ناشرین کردبێ.. ئەو ئەندازە کەمەی خوێندنی بە هەزار مەینەت لە چوار شوێن بۆ تەواوکرابێ..، لەگەڵ نەبوونی خوێندەوارو ڕۆشنبیرا لەو سەردەمەدا مەگەر بەدەگمەن، کە کوڵکە خوێندەوارەکان وەزیفەی بە سەنگ و ترازووی ئەو ڕۆژە زلیان ئەدرایە، ناچاری جگەرە فرۆشتنی دەستگێڕی ناو چاخانەو بازاڕ و کرێکاریی قیرتاو کردنی ڕێگا ببێ.. پاشانیش کە لەسەر کارێك دایئەنێن، مامۆستایەتیی قوتابخانەی لادێ دوور لە شارەکانیشی پێ ڕەوا نەبینن و بەرەو حیللە لێژی کەنەوەو، لەوە زیاتریش لە کاری دەربکەن.. هەر ڕۆژێ جۆرە ڕاپۆرتێکی لێ بنووسن و، هەر تاوە داوێکی بۆ بنێنەوەو، بەم جۆرە لە ڕێگای ژیانا دەیان جۆرە کولۆڵی و کوێرەوەریی بێتەڕێ، کەسێکی وا ناهەقی ناگرم ئەگەر خۆی لەم جیهانەدا بە بێکەس و نامۆ دابنێ و لە هەموو داب و نەریتێکی کۆمەڵ یاخی ببێو جاروبار بۆبە سووك تەماشاکردنی ئەو بەهایانەی لە کۆمەڵدا فەرمانڕەوان، شیعری وەك ئەم پارچە شیعرە بڵێ:

تووشی لافاوی عیلم بووم و بەڵام زوو دەرپەڕیم
سواری واپۆڕی جەهل بووم و بەناویا تێپەڕیم
سەد شوکر ئۆخەی نەجاتم بوو لە باسی عیلم و فەن
نامگرن جارێکی‌تر، بۆیە لە کەیفا هەڵپەڕیم
گەرچی تا ئێستا وتوومە: تێ‌بگەن زوو پێ‌بگەن
بەو قسانەم قەتعی‌یەن باوەڕ مەکەن، سەگ بووم وەڕیم
خوێندەواری شێتی‌یە، هەر جەهلە ئینسان سەرئەخا
گەر لەمەولا ناوی عیلمم برد بزانین سەرسەریم
هێندە تەعقیبی هەقم کرد تاکو نانی خۆم بری
سووك و ڕیسوا بووم لەناوا گیرۆدەی ئاخر شەڕیم
من کە زانیم حاڵی زانا نەفیە، حەپسە یا شەقە
هەر کیتابێکم هەبوو دوێنێ لەداخانا دڕیم
پیاوی دانا عەقڵی دانا، زانیی بۆی ناچێتەسەر
بەرگی نادانیی لەبەرکرد، بوو بە خاوەن زێڕو سیم
شەرتە کەر بم بارە گوێزم لێ بنێن خڕەی نەێی
با دەمێ زۆرو کەمێ وەك بێ غەمێ بۆ خۆم بژیم

ئەمە لە مەیدانی ناوخۆدا.

لە مەیدانی دەرەوەشدا کە ئەنجامی کاری ئیمپریالیستەکان لە وڵاتە ژێردەستەو داگیرکراوەکانا ببینێو ناکۆکیی لە چارکردن نەهاتووی ئیددیعاکانی مافی گەلان و ژیانی ڕاستەقینەی گەلان بێنێتە بەرچاوو بڕوانێ چۆن چەکی قەلاچۆکاری دائەهێنن و وڵاتانی پێکاول ئەکەن، هیچ بە سەیری مەزانن جارێکیتر ئەم گیانی بێمتمانەیی و ناهومێدییەی سەر هەڵداتەوەو لە تاوێکی بەرچاو تاریکیدا شیعری وەك ئەو شیعرەی بڵێ کە بە بۆنەی تەقاندنەوەی بۆمبای ئەتۆمی ئەمەریکاوە لە هێرۆشیماو ناکازاکی ووتوویەتی:

داخەکەم بۆ ئەو زەمانەی ڕووی زەمین
وەك بەهەشت بوو پڕ لە خۆشی و پێکەنین
بێ‌تەماع و بێ‌درۆو خاڵی لە قین
دڵنیاو دوور بووین لە ئۆتۆمی لەعین
تف لە عیلم و سەنعەت و صەد کارەبا
مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت مەرحەبا
یادی تۆ ئێستا لە دڵ خەم لائەبا

- - -

عیلمە ئێستا بۆتە مایەی دەردی سەر
عیلمە بۆتە واسیتەی مەحوی بەشەر
عیلمە تەسخیری ئەکەن هەر بۆ زەرەر
عیلمی چی؟ وابێ، هەزار خۆزگەم بە کەر
با وجوودی ڕادیۆو شەمەندەفەر
وا ئەبێ پێشکەوتن و عیلم و هونەر
تف لە عیلم و سەنعەت و صەد کارەبا
مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت مەرحەبا
یادی تۆ ئێستا لە دڵ خەم لائەبا..

باشترین بابەت ئەم پێشەکی‌یەمی پێدوایی بێنم لاواندنەوەکەی مامۆستا گۆرانە بۆ بێکەس کە هەر پاش مردنی دەسبەجێ وتوویەتی و یەکمجار لە یەکەم ژمارەی "گەلاوێژ"ی پاش کۆچی دوایی بێکەسدا لەگەڵ هەواڵی کۆچکردنەکەیدا بڵاوکراوەتەوە.

گۆران لەم لاواندنەوەیەی بێکەسدا وەڵامی گەلێ پرسیار لەبارەی هونەمەندێکەوە ئەداتەوە کە لە نزیکەوە ناسیویەتی گەلێ شتی وای لێك ئەداتەوە کە پێویستمان بە لێکدانەوەیەتی. لێکدانەوەی مامۆستا گۆران، بەتایبەتی لە بابەتی بێکەسدا، بایەخێکی زۆری هەیە چونکە وەك هونەرمەندێك و وەك هاوچەرخێك و هاوکارێکی لە ئازارو ژانەکانی دەروونیدا لەگەڵی هاوبەش بووە. ئەمەش تەواوی لاواندنەوەکەی گۆران:

هاوڕێم بێکەس!
ئەی فریشتەی شیعری جوان
کۆستی کەوتووی هەردوکمان
بۆ ئەمجارە(بێکەس)ە
کە وتمان(بێکەس)، بەسە
شاعیرێك بوو فەنا بوو
ئەدای خوڕ، خرۆشان بوو
بۆ باغچەی کزی کوردی
بلبل بوو نەغمەی وردی
سەرەڕای بەهرەی فەننی
دڵسۆز بوو بۆ وەتەنی
نرکەی شیعری ڕزگاریی
بێکەس، شتێکە دیاری
لە هەموو کوردستانا
لەناو بیر ئازادانا!

- - -

پەریی شیعری شۆخ و شەنگ!
تۆ دڵتەنگ و، من دڵتەنگ!
با سکاڵا بۆ یەکتر
لەگەڵ ئاخی ساردو سڕ
دوور و درێژ هەڵڕێژین
مەیتی بێکەس ئەنێژین!
ئاشنای تۆ بوو هاوڕێی من
لێی داگیر کردین (مردن)!
ئەی پەری! ناڕەوایە
فرمێسك لە چاومان نایە
چونکە بێکەس بچووك بوو
پایەی(کۆمەڵی)ی سووك بوو
کام پیاو ماقووڵ، کام گەورە
کە بەرزیی جێی ژوور هەورە
وێنەی ئەو جوامێر بوو
بەرابەر دوژمن شێر بوو
لە کاتێکا، ئەوانە

نۆکەر بوون بۆ(بێگانە)
دەست لەسەر سنگ ئەوەستان
یان بۆ پایە، یان بۆ نان
بێکەس بوو وەك پاڵەوان
پەنجەی لە چاوی چەقان
پەنجەی تیژی سەرزەنشت
داخی دڵی خۆی پێ ڕشت!...
بەڵێ بێکەس نابووت بوو
جار جار برسی بوو، ڕووت بوو
بەڵام کام تێر، کام پۆشتە
وێنەی ئەو، ئەی فریشتە،
بێباك وەستا، بەرامبەر
نووکی سونگیی ستەمگەر؟
کێ وا لەژێر زنجیرا
ئازادیی هات بە بیرا،
بە شیعری جوان نەڕانی
بە یادی کوردستانی!
ئەی شۆخ و شەنگ، ئەی پەری!
زۆرتر بۆ ئەوەی بگری
کە بێ بەرگی و بێ نانیی
خۆی لە ڕووی تۆ نەزانی
لەگەڵ ئەوەش تا مردن
نەکەوت لە تۆ پەرستن
ملکەچی قیبلەی ڕووت بوو
دێوانەی عیشوەو خووت بوو
وەك هەندێ شاعیری تر
تاڕادەیەك گورچکبڕ
تەماع هەڵی نەفریوان:
شیعر بفرۆشێ بۆ نان،
ئابڕووت بەرێ وەك بردیان
بەو کردەوانەی کردیان!
لەپاشانا، ئەی پەری
نابێ لە بێکەس بگری
کە گیرۆدەی مەستی بوو
مەستیی ئەو مەبەستی بوو
ناوچەو سەردەمی ژینی
پڕبوو لە ناشیرینی
وڵاتی پەرێشان بوو
بۆ هاووڵات زیندان بوو
نەتەوەی هەموو هەژار
مایەی ڕەنجیان بۆ زۆردار
هەموو برسی، دەغەزار
نەزان و نەخوێندەوار
دیل بوون: هەم بۆ بێگانە
هەم بۆ ئەو زۆردارانە
کە خۆیشیان ئەیان مژین
بۆ خەڵقیشیان سەرئەبڕین!
ئەمجا کە ئەیدی ئاوا

کەشتی بۆ گەرداو ئەڕوا
هەزاران هاوار بکرێ
کەس نییە ڕێی ڕاست بگرێ
ناچار خۆی سەرخۆش ئەکرد
هەستیی فەرامۆش ئەکرد
جار جار کە زۆر پەست ئەبوو
کەمێکیش بەد مەست ئەبوو
داخی دڵی خۆی ئەڕشت
بە جوێن، توانج؛ سەرزەنشت

- - -

ئەی فریشتەی چاو خومار
بەڵام بێکەسی هوشیار
بێکەسی دنیای نووسین
دانەری بەستەی شیرین
مەبەستی من و تۆیە
بۆ ئەوە ئەم ڕۆ- ڕۆیە
تۆ: پەریی شیعرو جوانی
من: هاوڕێی گیانی گیانی
دانیشین بە جووت دڵتەنگ
بڕێژین فرمێسکی مەنگ
بۆ شاعیرێك(بێکەس) بوو
بەڵام(کەس) ئێمەی بەس بوو
تۆ باڵای بۆ ڕەشپۆش کە
گڕی شیوەنی خۆش کە
بە پەردەی نزمی ماتەم
بەستەی کوردیی پڕ لە خەم
لەسەر مەیتی بخوێنە .
وەفای جوانی بنوێنە
بۆ شاعیرێك کە گیانی
لێی هەڵئەقوڵا جوانی
ئەگەرچی هۆی بەختی خۆی
جوانیی فەساڵ نەبوو بۆی
ناقوڵاو تێکسمڕاو بوو
ڕوومەت کونج، گزی چاو بوو
هونەر بوو، ڕووخۆشی بوو
کە خەوشی داپۆشیبوو
بەڵام، پەری! تۆ ژیری
خاوەندی هۆش و بیری
جوانیی باڵاو دەم و چاو
بەهرەی تا سەر نین بۆ پیاو
هەزار چاو جوان، قەدباریك
کەوتۆتە چاڵی تاریك
چی بەجێما لە دوایان
بۆ دۆست و ئاشنایان
یا جوانێك تا پیری ما!
کام گیرۆدەی بیری ما
خوێنی کوڵمی چەند گەش بوو
چاوو برۆی چەند ڕەش بوو

یەك جوانییە بای پایز
گەڵای زەرد ناکا هەرگیز
کە لە گیان، سەرچاوەی دڵ
سەر هەڵئەدا قوڵە- قوڵ
وەك ڕۆح سووکی، ڕووخۆشی
خوێن گەرمی، خزمەت کۆشی
دڵی باش، دەروونی پاك
بیری ڕوون، کردەوەی چاك
پێشتری گشت ئەمانە
بەهرەی هونەری جوانە!
بەڕاستی ئەو فەننان بوو
سەلیقەی شیعری جوان بوو

- - -

ئەی شێوە شۆخ! ئەی پەری !
دانیشە لای ژوور سەری
وەك یاری وەفادار بە!
بەڕاستی خەفەتبار بە!
قژی زەرد با پەشێو بێ
بەستەی خەم لەسەر لێو بێ
تۆ بڵێ و منی هاوڕێ
تا دەستم قەڵەم بگرێ
ئەنووسم دێڕ دێڕ، بەن بەن
بۆ(بێکەس) شیعری شیوەن!

~~~

## تێبینی

ئەم باسە پوختەی وتارێکە کە نووسەر لە کۆڕێکی ئەدەبیی یەکێتی نووسەرانی کورد لە سلێمانی ڕێکەوتی ١٩٧٨/١٢/٢٩ بەبۆنەی بیرەوەری ٣٠ ساڵەی کۆچی دوایی شاعیرەوە خوێندویەتییەو دواتریش لە دیوانەکەیدا بڵاوی کردۆتەوە.
~~~

# بێکەس و دوو وێستگەی فەرامۆشکراو

سیامەند هادی

زۆربەیکات لەگەڕانەوەماندا بۆ یادکردنەوەی شاعیرێك، بەشێوەیەکی گشتیی لەسەر دوو وێستگەی گرنگ دەوەستین. لەلایەك دەبێت بەقووڵیی بەنێو بەرهەمەکانیدا رۆبچین و، لەلایەکی دیکەشەوە پێویستە ئاماژە بەژیانی تایبەتی ئەو شاعیرە بدەین. گەلێکجار وێستگەی دووەم بەتەنها ئاماژەدانێکی رووکەشانە وەردەگرێت و زیاتر لەسەر وێستگەی یەکەم دەدوێین. بەڵام هەندێکجار هەڵوێستی ئەفسووناویی و رۆڵی ژیانی تایبەتیی ئەو شاعیرە لەگۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکاندا وادەکات بەقەد بەرهەمەکانی، بەتەواوی ئاوڕ لەژیانی ئەو شاعیرە بدەینەوە. یەکێك لەو شاعیرانەی ئەم روانینە هەڵدەگرێت (فایەق بێکەس)ی شاعیرە.

لەتەماشاکردنی ژیانی تایبەتیی (بێکەس)دا هەست بەتراژیدیایەکی گەورە دەکرێت و دەربەدەریی و راونان و گرتن سەراپای ژیانی ئەم شاعیرەیان داگیرکردووە. ئەوەی بەقووڵیی ژیانی ئەم شاعیرە بخوێنێتەوە، بەتەواویی دەگاتە ئەو بڕوایەی کە تاکە تروسکەیەك لەژیانی ئەم شاعیرەدا نەبووە وایلێبکات بۆ ساتێکیش بێت باوەش بەژیاندا بکات. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوەی جێگەی رامان و لەسەر وەستانە ئەوەیە کە دەبێت بەشێوەکی تایبەت لەسەر بوێریی ئەم شاعیرە بوەستین و ئەو هەڵوێستانەی شاعیر بەئازایەتی و بوێرییەوە گرێدەدات ئەوەندە کاریگەرن رێگەنادەن فەرامۆشیان بکەین. ئەگەر بەوردیی تەماشای ئەو وێستگەیە بکەین، دەبینین شاعیر لەو سەردەمەدا رووبەڕووی گەلێك لایەن بۆتەوەو تا کۆتایی ژیانیشی بەهیچ شێوەیەك چۆکی لەبەرامبەریاندا دانەداوە. ناکرێت ئێمە وەستانی شاعیر بەرامبەر دەسەڵات و ئایین و دابونەریتی کۆمەڵایەتیی لەوسەردەمەدا بەهەند وەرنەگرین و بەشێوەیەکی رووکەش ئاماژەیان پێبدەین. هەربۆیە ئەو وێستگەیە پێویستی بەچەند لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە هەیەو ئەوەش تائێستا بەتەواوەتی بەئاکام نەگەیشتووە.

وێستگەیەکی دیکە بۆ وەستان و رامان بەرامبەر ئەم شاعیرە، رۆچوونە بەنێو بەرهەمەکانیدا. راستە بەشێوەیەکی گشتی هێڵێك بۆ ناسینەوەی ئەم شاعیرە دەستنیشانکراوەو چەندین جارو لەچەندین شوێندا بەگوێماندا دەدرێت، بەڵام ئەو ئاماژە گشتییە نەیتوانیووە حەقی تەواو بەو شاعیرە بدات. دەگوترێت شیعرەکانی (بێکەس) هەڵگری دەلالەتێکی نیشتمانپەروەریی و ئازادیخوازین، بەڵام ناکرێت تەنها بەئاماژەیەکی وا ئەو شاعیرە بناسێنین. بەڵکو دەبێت بەوردیی و بەچەند لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە ئەو شێوە ناساندنانە رووکەشە تێپەڕێنین و جگەلە دەستنیشانکردنی هێڵی گشتیی و گوتاری شیعریی، ئاماژە بەدەلالەت و چۆنیەتی ئیشکردنی ئەم شاعیرە بدەین لەڕووی فۆرم و ناوەڕۆکەوە.

دەبینین زۆربەیکات (بێکەس) دوو روانینی دژبەیەکی هەیە بەرامبەر بەشتەکان. جارێك وەسفی زانست و کۆمەڵگەو رەوشی سیاسی دەکات و جارێکی دی لەدژیان دەوەستێتەوە. ئەمەش پەیوەندیی بەکۆمەڵێك دیاردەو ئەزموونی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەو ژیانی شاعیرەوە هەیە، چونکە لەواقیعدا ئەو شێوە تێڕوانینە دژبەیەکەی راستدەکەوێتەوە. سەرەڕای هەموو ئەمانەش لەو هەڵوێستە دژ بەیەکەشدا ئێمە هەست بەگوتارێکی نیشتمانی دەکەین، کە بۆتە هێڵێکی گشتیی ناسینەوەی شاعیر. (بێکەس) نەیویستووە بەتەنها وەسفێکی بێبنەمای کۆمەڵگەی خۆی بکات و بەشانوباڵی پێکهاتەی کۆمەڵگەکەیدا هەڵبدات، بەڵکو هەموو ئەو پێکهاتەیە لەزۆر شوێندا دەخاتە ژێر چوارچێوەیەکی رەخنەئامێزەوە، بەوەش کۆمەڵێك گومان و پرسیار لای ئێمە دروستدەکات. هەموو ئەمانە جێگەی لەسەر وەستان و پێویستە رەخنەگران بەشێوەیەکی تایبەتی ئاوڕ لەو دوو وێستگەیەی ژیان و بەرهەمەکانی شاعیر بدەنەوە. ئێمە بەپێویستی نازانین ئاماژە بەکۆمەڵێك هەڵوێستی ژیانی شاعیر بدەین. یان نموونە لەشیعرەکانی بهێنینەوە، چونکە دەزانین ئەوانە لای زۆربەی خوێنەران ئاشکران. بەڵام ئەوەی لێرەدا جێگەی بایەخپێدانە ئاوڕدانەوەیەکی جیدییە لەو دوو وێستگەیەی کە ئاماژەمان پێدان.

(بێکەس)بەهۆی ئەوەی کەم ژیا، رەنگە نەیتوانیبێت ئەو پرۆژەیەی کە لەسەری دەڕۆیشت بیگەیەنێتە ئاکام، چونکە ئەو تەنها چل و سێ ساڵ ژیا. ساڵی ١٩٠٥لەدایکبووەو لە ١٩٤٨/١٢/١٨دا کۆچی دوایی کردووە.

# بێکەس... پیاوێك لەڕەنگی خەمەکانی نیشتمان

## هەوڵدان بۆ خوێندنەوەیەکی تری شیعری بێکەس

جەبار سابیر

سـەردەمی رۆشنگەری ١٧٢٠-١٧٧٠ چاوی مرۆڤی ئەوروپایی کردەوەو، وای لێکردن بەجۆرێکی تر دنیا ببینن، هەر ئەم تازە روانینەی دنیا بوو، لەساڵی ١٧٧٨ گەلی فەڕەنسای هێنایە جۆش وخرۆش و شۆڕش لەفەڕەنسا هەڵگیرساو قەڵای باستیل کەڕەمزی سەرکوتکردن و تاریکی بوو رووخا.

تیۆرسینی شۆڕشی فەڕەنسی جان جاك ڕۆسۆ ئەو دەم وتی: دوای سەرکەوتنی شۆڕش تەکنیکارێك هەزار شۆڕش گێڕ دەهێنێت. هەربۆیە ئیتر ئالەو دەمەوە فەیلەسوف و خوێندەواران جەماوەرو گەلانیان بەرەو شۆڕش و رزگاربوون لەزوڵم و ستەم ئاراستە دەکرد، وەك چۆن مارکس و ئەنگڵس و دواتر لینین لەڕێگەی تێزە فەلسەفیە شۆڕشگێڕانەکانیانەوە پرۆلیتاریای ئەوروپایان بەگشتی ئامادەکرد بۆ شۆڕشکردن و راست بوونەوە بەڕووی رژێمە سەرمایەدارەکانی دەوڵەت و ئیمپراتۆرەکانی ئەوروپادا. سەدەی بیست بۆ تەواوی مرۆڤایەتی چەندە مایەی بەدبەختی و شەڕوشۆڕو دەردەسەری بوو ئەوەندەش سەدەی دۆزینەوە نوێکان بوو لەبواری زانست و تەکنۆلۆژیادا. کوردستان لەسەرەتای سەدەی بیستدا چەشنی پۆڕی خوراو لە مابەینی شای قاجاری فارس و سوڵتانی عوسمانی تورکدا تەنیا پەڕو پۆڵی مابوو، ژێرخانی ئابووری سفر بوو سەرخانیش کەسیاسەت و بەڕێوەبردنی وڵاتە لە خوار سفرەوە بوو، زمانی کوردی کەتازە ئاهێکی هاتبووەوە بەرو شاعیرانی سێکوچکەی بابان نالی و سالم و کوردی و دواتر حاجی قادری کۆیی شاعیری شۆڕشگێڕو تیۆرسینی نەتەوەیی مان مشتومالیان کردبوو، جارێکی تر خەریکبوو لەدەریای هەردوو زمانی عەرەبی و فارسیدا وەك ماسییەکی نابەڵەد بخنکێ. ئالەو دەورو زەمانەداو (٧)ساڵ دوای مردنی حاجی قادری کۆیی؛ لەگوندی سیتەکی نزیك سلێمانی فایەق بێکەس لەساڵی ١٩٠٥ دێتە دنیاوە. ئەو سەروبەندە بۆ تەواوی دنیاو بەتایبەت بۆ کورد چارەنوسسازو یەکلاییکەرەوەیە. لەڕوسیا ڤلادمێر لینین سەرگەرمی ئاراستەکردنی پرۆلیتاریایە بۆ ڕوخاندنی قەیسەرو هێنانە سەرکاری حکومەتی پرۆلیتاریا، لەتورکیا دەوڵەتە نەخۆشەکەی سوڵتانی عوسمانی لە گیانەلاّ دایەو لەئێرانیش سەردەمی مەشروتە خوازی لەلایەن قاجارییەکانەوە رادەگەیەنرێ کەبەنیازی ریفۆرمی سیاسین لەوڵاتدا. گەورەبوونی بێکەس لەناو ئەو هەراو زەنایەی دنیاداو بەتایبەت لەکوردستاندا بێکەس دەکاتە شاعیر.! بەپێی لێکدانەوەی ئەنتۆنیۆ گرامشی فەیلەسوفی هاوچەرخی ئیتالی رۆشنبیران دوو جۆرن، یەکێکیان ئەوانەن کە خوێندەوارن وەك مامۆستاو فەرمانبەرو ئیتر ئەوانەی دەتوانن بخوێننەوەو وەك سۆفستائییەکانی پێش سوکرات و ئەفلاتون ئەوەی دەیزانن بەپارە بەخەڵکی دەڵێنەوە، یاخود خەڵکی پێ فێردەکەن و جۆرەکەی تریشیان ئەوانەن کە ئەرکی رۆشنبیر جێبەجێدەکەن کە دیارە ئەرکی رۆشنبیر رێبەریکردنی خەڵك یاخود جەماوەری خەڵکە. بێکەسیش دەچێتە رێزەی دووەم دەستەی ئەو رۆشنبیرانەوە کە بەبڕوای(گرامشی) دەبێ پێشەنگی خەڵك بن بۆ هەر چەشنە گۆڕانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێشکەوتنخواز. بێکەس لەپاڵ ئەرکی مامۆستاییدا ئەرکی نیشتمانیشی راپەڕاندووەو لێرەشەوە ئەوەندەی وەك گوتاربێژێك کاریکردووە کەمتر بایەخی بەلایەنەکانی تری شیعر داوە کەبەبڕوای رۆبێرت شوڵس ئەوەندەی شاعیر زیاترو راشکاوانەتر دەوری قسەبێژ بگێڕێ، شیعریش ئەوەندە لەسنورەکانی وتار نزیك دەبێتەوە. لەسەر ئەم جۆرە گوتارانەش چەندین جار لەلایەن ئینگلیزو رژێمی پادشاییەوە بەندکراوە.

گەر لەمێژووی ئەوروپادا (گاری باڵدی ئیتالی و هۆڵدەرلینی ئەڵمانی) وەك شاعیرێك لەڕێگەی شیعرە حەماسی و ئاگرینەکانیانەوە نەتەوەکانیان کۆکردبێتەوە، ئەوا بێکەسیش هەمان وێنەی ئەوانەو وەك چۆن هۆڵدەرلین پێی وایە نیشتمان ئەو شوێنەیە جۆگە خوێنی لەشمانی پێدا دەڕوات و لێیشی وشك دەبێت. بێکەسیش لەسەرەوەختی رزگاربوونی زۆربەی نەتەوەکانی ناوچەکەو جیهانداو لەژێرکاریگەری ئایدۆلۆژی سۆسیالیستیدا کە دەوڵەتی کۆمۆنیستی شورەوی پەیڕەویدەکرد هاواری دەکرد داری ئازادی بەخوێن ئاونەدرێ قەت بەر ناگرێ. لای بێکەسیش دەبێت خوێنی مرۆڤ بەخاکی نیشتماندا پەخش و بلاّوبێتەوە، ئەو پێی وایە تا خوین جۆگەلە نەبەستێت نیشتمان نابێتە نیشتمانی ئێمەی کورد. ئەمەشی لەزۆربەی شیعرەکانیدا دووپات کردۆتەوە. دواکەوتوویی کۆمەڵی کوردەواری و داڕووخانی باری سایکۆلۆژی کۆمەڵگەی کوردی وادەکات خەڵکی کورد مل بۆ فتواو فەرمایشتەکانی سوڵتانی عوسمانی و دواتر

شافەیسەڵو ئینگلیز کەچکەنو پشت لەنەتەوەی خۆیانو ڕێبەری نەتەوەکەیان کە ئەو کات (شیخ مەحمود)ی نەمر بووە بکەنو خیانەتی لێبکەن، ئەمەش ڕەنگدانەوەی لەشیعری بێکەسدا زۆر زەقەو بەڵگەو نمونەی ناوێت. خوێندەواری عەیبەیەو ئەوکەمە خوێندەوارەی کە هەیە جگەلە مەلاو فەقێ لەلای خەڵك قێزەونو ئەوەشی هیواو ئومێدی بەدینو سوڵتانی عوسمانیو ئینگلیز نییەو نەماوە وەك (جەمال عیرفان) غافڵ کوژ دەکرێت. هەر ئەمەشە بێکەس ناچار دەکات بە دوو ئاراستەدا کاربکات لەهەردوو ئاراستەکەشدا خەمی بێکەس نەتەوەو ناسنامەکەیەتی کەزمانە، زمان لای بێکەس لەبیرناکرێتو تا ئەوشوێنەی دەستی بڕکات بەردی زمانی کوردی دەهاوێت... ئاراستەی یەکەمیان ئاراستەیەکی سیاسی نەتەوەییانەیەو، ئاراستەی دووەمیشیان ئاراستەیەکی زانستیانەو هاوچەرخانەیەو بەگشتی هەردوو ئاراستەکەش تەواو حەماسەتو بەرگرییەو بێکەس لەیەك کاتدا هەم وەك سەرکردەیەك، هەم وەك فەیلەسوفێك، هەم وەك زاناو وەك مامۆستاو وەك تاکێکی ئەم کۆمەڵگەیە کاری کردووەو لە دوای حاجی قادری کۆییەوە بێکەس گەورەترین شاعیری شۆڕشگێڕو نەتەوەییمانە. ئاگاداری پێشکەوتنە خێراکانی بواری زانستو تەکنۆلۆژیایە لەدنیاداو زۆر هەستیارو خوێندەوارەو یەکەم شاعیری کوردیشە کەلەڕێگەی شیعرەکانییەوە کورد لەو داهێنانانە ئاگادارکاتەوەو لەسەر ئاستی جیهانیش یەکەم شاعیرە کە شیوەن بۆ خەڵکی سڤیلی هێرۆشیماو ناکازاکی دەکات کە بەچەکی کۆمەڵکوژ ( ئەتۆم ) لەناو دەبرێنو بێکەس تفو نەفرەت بۆ زانستو تەکنۆلۆژیادەنێرێت کەبەدەست زاڵمو چەوسێنەرانەوە خەڵکی پێدەکوژرێ.تف لەعیلمو سەنعەتو سەد کارەبا/ مەرحەبا ئەی جەهلو وەحشەت مەرحەبا/ یادی تۆ ئێستا لەدڵدا خەم لادەبا. ئالێرشەوە ئەوەندە نائومێدە لەگەورەکان ، ئەوەندە سوکایەتی ئەو جیلەی چەشتووە ناچارو بەمەبەست ڕوودەکاتە منداڵانو باسی دروستکردنی فڕۆکەیان بۆ دەکاتو پێیان دەڵێت: لە شەڕدا موسیبەتە، لەئاشتیدا نیعمەتە، ئەوە بوو یەکەم فڕۆکە لەناوچەکەدا لەساڵی ١٩٢٣ شاری سلێمانی بۆمباباران کرد. شیعری بێکەس شیعری سەردەمی نوێ یەو قەڵەمبازی شیعری کلاسیکە بەرەو نوێ، لەشیعری بێکەسدا کەرەسەو بابەتەکان نوێنو زمانیش ئەو زمانەی شاعیرانی پێشتر نییەو، سیمای شارستانیو هاوچەرخی بە شیعرەکانییەوە دیارە. گەر شارل بۆدلێر مەعریفەی تێکەڵاوی شیعر کردبێتو بۆ یەکەمجار ووشەی مۆدێرنێتەی بەکارهێنابێت، بێکەسیش لەو کەمتری بۆ نەتەوەکەی نەکردووەو لەدوای حاجی قادرەوە بێکەس دووەم شاعیری کوردە کەباس لەپێشکەوتنو شارستانی بوونو هەڵکردنی چرای زانست دەکات. بێکەس باسی فڕۆکەو مەکینەی هەڵمو رادیۆو ووزەی کارەبا دەکات، لەڕۆژی دانانو دەست بەکاربوونی ووزەی کارەبا لەسلێمانی بێکەس شیعرێك دەنوسێت بەناوی (ئەلکتریکی سلێمانی) کەئەمە جگەلەوەی ئاماژەیە بۆ یەکەمجار هێنانی ووزەی کارەبا لەکوردستاندا سەراپای شیعرەکە هاوارە بۆ پێشکەوتنو هاوشان لەگەڵ ئەوەشدا وێنەی شیعری لەبیر نەکراوە

تریفەی کارەبا ئێستا لەناو حەوزو درەختا وەك/ تریفەی مانگو ئەستێرە شەوانی سایەقەی پاکە

بێکەس تەنیا ڕووناکی ماڵو سەرجادەو کۆڵانی ناوێتو ئەوەی ئەوی دەردەدار کردووە جاهلیو مێشك ووشکیو دواکەوتوویی خەڵکەو لێرەوە ئاواتەخوازی ئەوەیە کارەبا هەر بەوەندەوە نەوەستێت ماڵو کۆڵان ڕووناك بکاتەوە بەڵکو مێشکیشمان پێویستی پێیەتیو وەك پلاریش بەخەڵکی کۆمەڵگەکەی دەڵێت: ئەوا کارەباش گەیشتە ماڵەکانتان هێشتا باوەڕتان بە هێزوو ئیرادەو مێشکی خۆتان نییە.

وەکو کۆڵانو سەرجادەو کونو قوژبن منەوەربوو/ دەماغو فیکرو مێشکمان وەها تەنویر بکەین چاکە

ئەو شتانەی بێکەس باسیان دەکات تێکڕا داهێنانەکانی دوای ڕۆشنگەریو سەردەمی مۆدێرنێتەن، بەڵام جیاوازی بێکەسو بۆدلێر تەنیا ئەوەیە بۆدلێر دەوڵەتێك لە ئامێزی دەگریو بێکەسیش دەوڵەتی نییەو خاوەن کۆمەڵگەیەکە وەك خەیاری تاڵ تفی دەکاتەوە.

ڕۆژی کارەباو رادیۆو بوخارە/ هەر قووەتو فەن ئەمڕۆ بەکارە.

ئەم هاوارو هەنگامەیەی بێکەس بۆ پێشکەوتنو شارستانی بوون، دەرهاویشتەی ئەو دۆخە نالەبارەی ئەوسای کوردە بەدەست تورکو عەرەبو فارسەوە، جارس بوونە لەدەست دواکەوتوویی و نەخوێندەواری، لەسەردەمی بێکەسدا خوێندەوارو خەڵکانی ڕۆشنبیر تەنیا شاعیرو مەلاکان بوونو مەلاکانیش هەر جۆرە خوێندەوارییەکیان بەزمانی کوردی بەلادان لەدین لەقەڵەمداوەو بەپێی سەرچاوە مێژووییەکانیش تاساڵی ١٩٣٥ لەشاری سلێمانیدا تەنیا (٤) خوێندکاری کچ یا ژن هەبووە. هەرئەمەش والە بێکەس دەکات ئەوەندەی وەك ریفۆرمیستێکی کۆمەڵایەتیو پابەند بەخەڵك کاربکاتو لەو ڕێگەیەوە شیعرەکانی بەخەڵك بگەیەنێت ئەوەندە وەك شاعیرێکی جوانیناسیو ناتورالیست کارنەکاتو دەرنەکەوێت. لای بێکەس سروشتو خەڵك یاسروشتو کورد ئاوێتەو ئاوێزانو هیچیان بێئەویتریان نرخیان نییە، ئەو سروشتێکی ناوێت خەڵکی لێ دابڕێت. سروشت بەبڕوای بێکەس ئەو خەڵکەیە کەلەگەڵیاندا دەژی، نە بێ ئەوان هەڵدەکاتو نەلەگەڵ ئەوانیش توانای ژیانی هەیە، بۆیە هەمیشە بەسەریاندا دەقیژێنێو لێیان تووڕە دەبێت. کۆڵنەدەرانە هەوڵی چاککردنی ئەو دۆخەی کۆمەڵگەکەی دەدات، هەرلەتانە دان

له رووبەندو پەچەی ژنانەوە تا دەگاتە قوماروو دزیو درۆو فیتنەو ئاژاوەی کۆمەڵایەتی. وەك یەکەم شاعیریش دەیناسین کەداوای یەکسانی کۆمەڵایەتیو بەرامبەری ژنو پیاو دەکاتو پێی وایە تا ژنو پیاو وەك یەك بەشدارنەبن لە بوارە رۆشنبیریو سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتییەکاندا مەحاڵە کۆمەڵگە رزگاری بێت ئەمەش دەمانباتەوە سەر قسەکەی ئەنگلس کەدەڵێت: رادەی رزگاری هەر کۆمەڵگەیەك بەندە بەرادەی بەشداری ژن لەو کۆمەڵگەیەدا. ئۆباڵی تەواوی نەهامەتییەکانی کۆمەڵگەی کوردیش دەخاتە ئەستۆی نەخوێندەواریو رێگە گرتن لەبەشداری ژن لەتەواوی بوارەکاندا، لێرەوە یەکەمین بانگەوازی یەکسانیخوازی لە دوای قاسم ئەمینی بەرەچەڵەك کوردەوە لەکتێبی (ئازادکردنی ئافرەت)ەوە لەلایەن بێکەسەوە بەگوێی کۆمەڵگەی کوردیدا دەدرێت، هاواری بێکەس هاوارێکە دژی جەهلو بۆ راچەنینو بێدار بوونەوەی کۆمەڵگەو ژنە.

نەسرین دەمێکە داخت لەدڵمە/ گیرۆدەی
بەندی، ژیانت زوڵمە

ئەم هاوارە تەنیا، هاوارێك نییە بۆ لادانی کۆمەڵایەتیو بڵاوکردنەوەی فەسادی کۆمەڵایەتیو سنوور بەزاندنی دابو نەریت، لەدێرەکانی دواتردا بێکەس بیانوی هاوارکردنەکەی بەدەستەوە دەداتو زیاتر مەبەستی هاوارەکەی روون دەکاتەوە.

ئەمرۆ زەمانی عیلمو عیرفانە/ عالەم
شەوو رۆژ والە فەرمانە/ فەرقی نێروو مێ
نییە بیزانە

هاوکات بەر لەهەنجەتەکانی رەگەزی مێ دەگرێتو خۆی وەك ئەو دەناسێنێو پێی دەڵی ئێتر ئەمە دیوەخانو بەر هەیوانی خێڵ و هۆز نییەو شارستانییەت لەسەر باڵی نێروو مێ دەفرێت بەرەو ئاسمانی پێشکەوتن

مەڵێ من کچم، تۆش وەکو منی/
موحتاجی عیلمو فەنو خوێندنی/ مەجبوری
ئیشو خزمەتکردنی

نەسرین لای بێکەس تاقە کەسێکی یا کچێکی دیاریکراو نییەو تەواوی رەگەزی مێ دەگرێتەوە لە کۆمەڵگەی کوردیدا. کارکردنو هەڵکۆڵین لەکەموو کوڕیو کەمایەسییەکانی کۆمەڵگەو رەخنە لێگرتنیان لای بێکەس لەهەمووشت لەپێشترەو لەتەواوی شیعری بێکەسدا خاڵی دابڕان بەدی ناکرێت لەنێوان خودی بێکەسو نیشتمانو، کۆمەڵگەکەیدا هەم وەك شاعیرو هەم وەك ئینسان. ئەمەش دەمانباتەوە سەر هەمان بۆچوونی رەخنەگری سۆسیالیستی (جۆرج بلیخانۆف) کەدەڵێت: ئەوەندە بەس نییە بڵێین هونەرو دەقی ئەدەبی فۆرمی وێنەیە بۆ ژیان. هونەر دەبێ دەستپێکی دەربڕینی ژیان بێت لەدینامیکی گۆڕاوەکانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەکەی تێبگات. هەر بەبڕوای بلیخانۆف هونەر دەبێ بگاتە قۆناغی رەخنەگرتن لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. کەدیارە هونەرو ئەدەب دەست لەملانی یەکترن. بێکەسیش ئەرکی شیعری بەو رەخنەگرتنە لەپەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان ئەوەندە قورس کردووە کەمتر پەرژاوێتییە سەر ئەوەی ئاوڕ لەخودی شیعرو هونەری شیعر بداتەوەو، لای بێکەس(شیعر بۆ ژیان بووە) نەك بۆ شیعرو، بەبڕوای بێکەس شیعر دەبێت ئاوێنەی واقعی کۆمەڵگەبێت. دەبێت ئاوی شیعر لە چاوەی زوڵاڵی کۆمەڵگەوە قوڵەقوڵ هەڵقو لێت. بۆیە گەر لەرووی سایکۆلۆژییەوە قسە لەسەر بێکەسو شیعری بێکەس بکرێت دەبینی وشەو وێنەی شیعرەکانی رەنگانەوەی سیماو ناخی خۆیو دواتر رەنگدانەوەی ژیانە تفتو تاڵو رەقو وشکەکەی کۆمەڵگەکەیەتیو ئالێرەشەوە ئەو حاڵەتە سەر پێ ییە (ارتجالی) یە لەشیعری بێکەس دا بەروونی دەبینرێتو ئەوەی بێکەس نوسیویێتی یاخود وتویێتی یەکجاربووەو پاکنوسو رتووشو شتی لەو بابەتەی نییەو، هەست بە زبریو رەقیو گەرمیو ساردی وشەکان دەکرێت.

شەرتە شەرتی پیاوەتی بێت گەر خودا
دەستم بدات/ دوژمنت پەت کەم وەکو سەگ
بیخەمە ژێر پێتەوە

ئێتر ئەمە ئەوپەڕی هەڵچوونی بێکەسەو، لوتکەی ئەدەبی بەرگری کوردی پێشان دەدات، ئەوەی لەو چرکە ساتەدا بەخەیاڵی شیعری بێکەس دا هاتووە گۆڕانی بەسەردا نەهێناوەو، شتێکیش کە دەکرێت وەك پرسیار خۆی قوتکاتەوە ئەوەیە تۆبڵێی بێکەس چەند شیعری فەوتابێتو نەخۆی فریای نوسینی کەوتبێت، نەخەڵکانی دەورووبەری بۆیان نوسیبێتەوە. بەپێی قسەی شایەتحاڵەکانی ئەودەمیش شەوێك لەسەربانی ماڵێك کۆڕی بادەنوشینو شیعر ووتن دەبەسەترێ بێکەس لەدەمی مەستیا شیعری ئەی مانگ منو تۆ هەر دووك هاودەردین دەڵێت یەکێك لەئامادەبوان دەینوسێتەوە، دوای چەند رۆژێك بۆی دەخوێنێتەوە بێکەس دەڵێت ئەوە شیعری کێیە.؟ کابرا دەڵێ شیعری تۆیە بێکەس ئاخێك هەڵدەکێشی باوەڕ بەقسەی کابرا ناکات. شیعری بیستو حەوت ساڵە من رەنج بەری تۆم لەساڵی ١٩٤٦ لەبەرامبەر ئەدمۆندزی حاکمی سیاسی ئینگلیزدا دەخوێنێتەوەو پەنجەی رووەو چاوی ئەدمۆندز بەرزدەکاتەوە کەئەمەش بەڵگەی جوامێری جورئەتی بێکەسەو یەکێك بووە لەرەخنەگرە سەرسەختەکانی سیاسەتی ئینگلیز لەبەرامبەر کورد دا. بەبڕوای من شیعری بێکەس بەتەواوی بوارە کۆمەڵایەتیو سیاسیو گاڵتەوگەپو مناڵانو سروودەوە، هەمووی بەرهەمهێنانی یەك گوتاری بەرگریو مانەوەیەو گەڕانە بەشوێن ناسنامەی نەتەوەیی خۆیدا کەئیتر لەبێکەسەوە جارێکی تر گیانی بەبەردا دەکرێتەوە. هەربۆیە گەر بێکەس شێوازی گوتاربێژی خۆی لەبوارێکی شیعرەوە بردبێتە بوارێکی تر، وەك لەکوردایەتییەوە بۆ کۆمەڵایەتیو دواتر گاڵتەو گەپو مناڵان، هەموو یەك مەبەستی لەپشتەوەیەو لەلایەك وریایی بێکەس دەردەخات بەگۆڕینی

تەکنیکی گوتاربێژیو ئاراستەی قسەی لەچینێکەوە بۆ چینێکی تری کۆمەڵگە. لەلایەکی تریشەوە بێ ئومێد بوونی بێکەس دەردەخات، بێ ئومێد بوون لەتەواوی کۆمەڵگە. بێکەس کاتێك ڕووی دەمی دەکاتە چینی هەرە خوارەوەی کۆمەڵگە بێ ئومێدە لەوەی چینی سەروتر قسەکانی وەرگرن، بۆیە ڕوودوەکاتە ئەوانو بەهەمان وشە سادەو ساکارەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان دێتە گۆ. نا ئومێد بوونی زیاتری بێکەس لە کۆمەڵگەکەی لەو بایەخدانە زۆرەوەی دێت کە بەمنداڵی داوە. مناڵ لای بێکەس وەك بەفری دەست لێنەدراو وایەو هێشتا چڵکی ڕۆژگار و دەستی زەمانە نەیگەیشتۆتێ، مناڵ ئاییندەیەو دەکرێ هیوای لەسەر هەڵچنرێ، بۆیە وەك یەکەم شاعیری کورد زۆرترین کاری بۆ مناڵان کردووەو هەرچی پێشکەوتنو تازەگەریو خۆشەویستی نیشتمانو ئازادیو یەکسانی کۆمەڵایەتیو شارستانییەتە لە ڕێگەی شیعری مناڵانەوەو بەزمانی ئەوان باسی دەکات.. بەوەشەوە ناوەستێتو لەڕۆژی ١٩٣٠/٩/٦ مناڵانی مەکتەبی زانستی کۆدەکاتەوەو لەپێشیانەوە دەڕوات بەرەو سەراو هوتاف دژی ئینگلیزو شافەیسەڵ دەڵێنەوەو هاوار لە بارودۆخی خراپی کوردستان دەکەن.. ئەوەبوو ئەو ڕاپەڕینە بەزەبری ئاگرو ئاسن دامرکایەوەو عەولەسیسی پاڵەوانی نەتەوەییمان شەهید دەکرێتو بێکەسیش بەند دەکرێت. دواتر شیعرە ناودارەکەی ( وەفدی کوردستان ) دژی ئەو کەسانە دەنوسێت کە سازش لەگەڵ ئینگلیزو شا فەیسەڵ دەکەن، کەسەر لەبەری حەماسو نائومێدیو سەرکۆنەکردنی کۆمەڵگەو خەڵکەناپاکەکەیەتی. بێ هیواییو خەمی نیشتمان بێکەس دەردەدار دەکەنو دەیگەیەننە بارودۆخێکی سایکۆلۆژی زۆر خراپ، ئەم حاڵەتە سایکۆلۆژییەش لەشیعری ( تووشی لافاوی عیلم بووم ) دا تەواو ڕەنگی داوتەوەو بێکەس لێرەدا کەساسانەو بەمەحزوونی دەڵێت:

من کەزانیم حاڵی زانا نەفیە، حەپسە، یاشەقە/ هەر کتێبێکم هەبوو دوێنێ لە داخانا دڕیم.

بەخوێندنەوەی چەند جارەی شیعرەکانی بێکەس ئەوەت لائاشکرا دەبێت کە بێکەس شاعیرێکی تووڕەو یاخی بووەو زۆربەی شیعرەکانی ئەم تووڕەبوونو هەڵچونو یاخی بوونەی پێوەدیارەو، بۆ سارێژ بوونەوەی برینو خەفەبوونی تووڕەبوونەکانی پەنای بۆمەی بردووە، بەڵام وەك گۆران دەڵێت: ئەو گیرۆدەی مەستی بوو/ مەستی هۆی مەبەستی بوو. ئالێرەشەوە پەیوەندی بێکەسو مەی پەیوەندییەکی دیالیکتیکییەو شیعر بەرهەمی ئەو دیالیکتیکەیە.

لای بێکەس مەی نۆشین گێڕانەوەی ئینسانە بۆ ئەسڵی خۆی.! وەك ئەوەی کەهەیەو دوور لەڕتووشو قەیدوبەندی کۆمەڵایەتیو هەستیارو بەئاگا. مرۆڤ لەکاتی مەی نۆشیندا تریێ ڕەشەکەی ژیان دەبینێت بەرلەوەی بکرێتەمەیو شەراب، لێرەشەوە چاوی قەڵەمی بێکەس لەدەمی مەستیدا تیژتر دەبێتو هەموو شتێکی ناشرینو دزێو دەبینێت. بۆیە بۆ بێکەس مەی نۆشین تاکە دەروازەیە بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەوەی لەناخی پڕ ئاخیدا پەنگی خواردۆتەوەو باشترین پەناگە بۆ بێکەس مەستی یەو هەرچی ڕازوو خەمو ئازاری بێکەسە لەدەمی مەستیا خۆیان نمایش دەکەنو دەبنە پشکۆو ژیلەمۆو وەك ئەستێرەی گەلاوێژ دەدرەوشێنەوەو، بۆ دوژمنانیش دەبنە گوللەو لێرەشەوە من واهەست دەکەم بێکەس حەقی خۆی نەدراوەتێو زۆرلایەنی شاراوەی ژیانی هێشتا وەك ڕازێك ماوەتەوەو دەکرێ کەشف کرێن لەڕێگەی نوسینو هەڵکۆڵینەوە، چونکە پێم وایە بێکەس هاوتای لۆرکاو پۆشکینو زۆرشاعیری تری جیهانییە، کەنمونەی بەرخودانو یاخی بوونن دژی ڕژێمی سەرکوتکەرو دابونەریتی سەپاوی کۆمەڵگە.



# بێکەس لە ڕوانگەی گۆرانەوە

لوقمان ڕەئوف

"شوناس لەپانتاییە کۆمەڵایەتییەکەی ناو ئەم شیعرە، بریتییە لەخوێندنەوەی ڕۆح، لێرەوە گۆران دەرگایەك بۆ ناسینی بێکەس وەك حەقیقەت و ناوەڕۆك، نەك وەك سیماو جەستە دەکاتەوە، بەمەش دەتوانین بەدووری لەسەردەمەکەوە، بێکەس وەك هزر بناسین و ڕۆڵ و ئەرك و دڵسۆزیی وەك تاکێکی کوردی بخەینەڕوو، بەدەر لەوەی کە تا ئێستا لەچوارچێوەی لاپەڕەکانیدا وەك شوناس نەبڕیوە.

بێگومان بێکەس کەسێك بووە هەر لەسەرەتای منداڵییەوە تاوەکو کۆچی دواییکردنی، ژیانی پڕبووە لە نەهامەتی، بۆ نموونە لەتەمەنی سێ ساڵیدا، تووشی ئاوڵەبووە، دواتر کۆچی دواییکردنی باوکی و خنکانی برا گەورەکەی لەئاوی دیجلەداو مردنی دایکی و بێهیوابوونی پاش چوونی بۆ تورکیا لەپێناو سۆراغی باوکی، لەناو هەموو ئەم نەهامەتی و دەردەسەری جەستەو ڕۆحییەی بێکەسدا، بێکەس نەیتوانیوە دەست لەو ئایدیایە هەڵگرێت کە لەپێناویدا ژیاوە، هەرچەندە هەندێ جار دەکەوێتە گەرداوی بێهیوابوونەوە، ئەمەش نەك لەپێناو وازهێنان و ساردبوونەوە، بەڵکو ئەم بێهیوابوونەش لە قاڵبی خەم خواردندایەو ڕادەی پەرۆشبوونی دەخاتەڕوو، چونکە گەورەترین خەمی لەم جیهانەدا نیشتمان و ئاکامەکەی بووە، هەر لەبەرئەمەش تا دواساتەکانی ژیانی بۆی ژیاوە، بڕوام وایە یەکێك لەو هێزانەی کە گوڕی بەبەردەوامی ژیان و ئارامگرتن لەسەر ئەو نەهامەتیانەی بێکەس دابێت" نیشتمان و کوردپەروەری بووە، زۆر هەن کە دەگیرێن، دەست لەخەبات هەڵدەگرن، بەڵام ئەم سووربوونی زیاتر دەبێت، بەشێوەیەك لەگەڵ ناڵەباری ژیانیدا، دەست لەبژێوی ژیانی هەڵدەگرێ و لەپێناو نیشتماندا دووجار خۆی قوتابخانە دەکاتەوەو وانەی تێدا دەڵێتەوە، ئەمەش لەپێناو نیشتمان و گەلدایە، ئەگینا کێ هەیە لەو هەلومەرجە ناڵەبارو تایبەتەدا خۆی بکاتە قوربانی بۆ نیشتمان و لەپێناویدا ژیان و خۆی لەبیربکات.

لەپاش مردنی فایەق بێکەس لە ١٩٤٨/١٢/١٨، گۆران شیعرێکی لاواندنەوەی بۆ دەنوسێ بەناوی" (هاوڕێم بێکەس)، لاواندنەوەش لەڕاستیدا بریتییە لەخستنەڕووی کۆمەڵێك سیفەتی تایبەتیی ئەو کەسە، بۆیە کاتێك ئەم شیعرەی گۆران دەخوێنینەوە، لەدەستپێکردنەوە تاوەکو کۆتایی جگە لەخستنەڕووی چەند حەقیقەتێکی ژیان و ئایدیای بێکەس، هیچی تر بەدیناکەین، لێرەدا گۆران زۆر بەڕاشکاوی شتەکان دەڵێ، زۆرجار کە شیعرەکە دەخوێنیتەوە، وادەست دەکەیت کە پاش بیستنی هەواڵی کۆچی دوایی بێکەس، گۆران ڕاستەوخۆو لائیرادی ئەم شیعرەی وەك جوڵانی ناخی و دەرخستنی ڕۆڵی ئەم دڵسۆزەو داخ خواردن بۆ لەدەست دانی کەسێکی دڵسۆزو نیشتمانپەروەر نووسیوە، واتە سەربازێکی شاعیرو ڕۆشنبیرو سیاسییەکی ون، ئەو کەسەی کە خەمی هەموو نەتەوەکەی لەکۆڵ گرتبوو، کەواتە لێرەوە دەتوانین چەند ئازشێك دیاری بکەین:

١- شوناس لەسیمادا: گۆران بەچەند بەیتێکی ئەم هۆنراوەیە، سیمای بێکەسمان پێدەناسێنێت و دەڵێ:

**ئەگەرچی هۆی بەختی خۆی/ جوانی فەساڵ نەبوو بۆی!/ ناقۆڵاو تێکسمڕاوبوو/ ڕوومەت کونج، کزی چاوبوو**

لێرەدا گۆران ئەوەمان پێدەڵێت کە شاعیر دەموچاو کونج بووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ تووشبوونی بەئاوڵە، بەتەواوی ناڵێت ناشرین بوو، بەڵکو هۆی ناشرینبوونەکەی دەخاتەڕوو.

لەم بارەیەشەوە برادەرێکم بەسەرهاتێکی مامۆستا بێکەسی بۆ گێڕامەوە، جارێکیان مامۆستا بێکەس دەچێت بۆ لای هاوڕێیەکی لەیەکێك لەقوتابخانەکانی شاری سلێمانی، کاتێك کە دەوام تەواو دەبێت، بێکەس لەگەڵ مامۆستا برادەرەکەیدا دێتە دەرەوە، لەو کاتەشدا قوتابیەکان دەچنە دەرەوە، کە بێکەس دەبینن هەموویان لێی کۆدەبنەوەو بەسەرسامییەوە سەیری دەکەن و بزە دەیانگرێت، مامۆستا برادەرەکەشی کە ئەمە دەبینێت ئیحراج دەبێت و هەوڵدەدات قوتابیەکان دووربخاتەوە، بۆ ئەوەی بێکەس هەست نەکات کە ئەم قوتابیانە سەیری ئەو دەکەن و بزە دەیانگرێت، بەڵام بێکەس بەمە دەزانێت و بەمامۆستا برادەرەکەی دەڵێت" مامۆستا وازیان لێبهێنە، چونکە ئەم قوتابیانە مرۆڤی لاوازو قەڵەوو ڕەش و سپی و کورت و درێژیان بینیووە، بەڵام مرۆڤی وەك من مورەبەعیان نەبینیوە!! بەمەش هەموویان دەست دەکەن بەپێکەنین و مامۆستاکەی برادەریشی زۆر دڵخۆش دەبێت کە مامۆستا بێکەس ئەوەندە دڵی فراوان و واقیعبینە، لەمەشەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مامۆستا بەشێوازێکی تر جیهان و ژیانی خوێندوەتەوە، لەبەرئەوە هەرکەسێك بەو شێوازەش ژیانی بێکەس نەخوێنێتەوە، ئەوا لەبەهاو جوانی بێکەس ناگات و نایبینێت.

عەللادین سجادی دەڵێ" بێکەس پیاوێکی میانەباڵای تێکسمڕاو بووە، سەری زل و دەموچاوی گرد، چاوێکی کوێرو ئەوی تریشیان نیوەی هەبوو، لوتی پان بووەو دەمی بچووک و کەمێك سمێڵی ئەهێشتەوە، زۆر بەتەنگ جل و بەرگەوە نەبووە، لەقسەدا لەسەرخۆبووە، لەدواساتەکانی ژیانیدا تووشی ڕەبۆ بووە، باری ژیانی چەوساوەبووە، هەرگیز شەرمی لەکەس نەدەکرد، لەگەڵ ئەمەشدا زۆر زمان پاك بووە لەشیعردا، قەلەندەر بوو، بۆیە بوو بەڕەند!

ئەم وێنەکێشانەی مامۆستا سجادی بۆ بێکەس، وەسفێکی پەرێزانەبووە، بۆیە قسەی لەسەر ئەو هۆکارانە نەکردووە کە لەسیمادا بێکەس تووشی بووە، واتە هەر بەزگماکی کوێربووە، یاخود هۆی گرتنی نەخۆشییەکە بووە، کەچی گۆران واسەیری بێکەس ناکات، بەڵکو جوانێکی سەرنجڕاکێشیشی پێ دەبەخشێت و دەڵێ:

**خوێنی کوڵمی چەن گەش بوو؟/ چاو و برۆی چەن ڕەش بوو؟**

کەواتە چاو و برۆی بێکەس لەڕاستیدا جوانبووە، بەڵام هەموو ئەمانە واتە ئەم سیمایە لەلای گۆران بێبایەخ بووە، چونکە دەڵێ:

**جوانی باڵا و دەم و چاو/ بەهرەی تاسەر نین بۆ پیاو**

لێرەوە گۆران وێڵە بەدوای شوناسێکی تردا بۆ مرۆڤ و بێکەس، نازین بەسیماو جوانیدا خۆی بۆخۆی جۆرێکە لەنەخۆشییە دەروونییەکان، گۆرانیش هەموو جوانییەکان لەناخدا دەبینێتەوە، کە ئەویش جوانی ڕۆحە، بەمەش شوناس ناوەکی بێکەس دەخاتەڕوو، لەم پێناوەشدا بە بەڵگەی واقیعی پاساو بۆ سیماو ناشرینییەکەی دەهێنێتەوە لەپێناو ناساندنی ناوەڕۆکی بێکەس بەخەڵکی، واتە دەیەوێت بڵێت" ئەی کوردینە، بێکەس لەناوەڕۆکدا بخوێننەوە، نەك بەسیما، وەك دەڵێ: چونکە

**هەزار چاوجوان قەدبارێك/ کەوتوونە چاڵی تارێك/ چی بەجێ ما لەدوایان/ بۆ دۆست و ئاشنایان/ یا جوانێك تا (پیری) ما/ کام گیرۆدەی بیری ما**

بەمەش گۆران جوانی ناخ پەسەند دەکات بەسەر ڕووخساردا و بەهاو بەنرخی بێکەس دەخاتەڕوو، بەوەی بێکەس یەکێکە لەو شاعیرانەی کە لەبواری هزری ئازادیدا، شۆڕشێکی لەناو خەڵکیدا بەشیعر دروستکردووەو تا ئێستاش لەگەڵ ئەم ناشرین بوونەیدا، توانیویەتی درێژە بەمانەوەو خۆشەویستی خۆی لەدڵی خەڵکیدا بدات، نەك بەمردنی هەمووشتەکان لەگەڵ خۆیدا بنێژرێت.

٢-شوناسی گیانی: گۆران شوناسی گیانی بەهەڵقوڵان و ڕەنگدانەوەی چەند کارو هەڵوێستێکی گشتی و جوان لەناخدا دەخاتەڕوو، لەم پێناوەشدا جوانی و بێگەردی بێکەس وەك ڕۆح دەهێنێتەوە، بۆنموونە:

بۆشاعیرێك کە گیانی-لێی هەڵئەقوڵا جوانی،

یاخود: **وەك ڕۆح سوکی، ڕووخۆشی/ خوێن گەرمی، خزمەت کۆشی/ دڵی باش، دەروونی پاك/ بیری ڕوون کردەوەی چاك**

ئەم وەسف و خستنەڕووانەی بێکەس لەلایەن گۆرانەوە، بەتەواوی پێچەوانەی سیما و پێگەو ئاستی دەروون جوانی بێکەس دەخەنەڕوو، لەڕاستیشدا هەر ئەمەش خۆشەویستی کردبوو لەلایەنی خەڵکی.

٣-بەهرەمەندی بێکەس: لەم ڕووەوە گۆران تەکنیکی نووسین و ئاستی شاعیریەتی بێکەس و پێشەنگبوونی لەگەڕان بەدوای هزرو نیشتمانی ئازاددا لەسەردەمەکەی خۆیدا دەخاتەڕوو:

**بێکەسی دنیای نووسین/ دانەری بەستەی شیرین/ پێشتری گشت ئەمانە/ بەهرەی هونەری جوانە/ بەڕاستی ئەو فەنان بوو/ سەلیقەی شیعری جوان بوو/ شاعیرێك بوو فەنان بوو/ ئەدای خوڕ، خرۆشان بوو/ سەرەڕای بەهرەی فەنی/ دڵسۆز بوو بۆ وەتەنی/ نرکەی شیعری ڕزگاری/ بێکەس، شتێکە دیاری/ لەهەموو کوردستانا/ لەناو بیر ئازادانا!**

٤-گۆران زۆر بەوردی ئاست و گوزەرانی بێکەس دیاریدەکات و بەڕاشکاوی دان بەحەقیقەتی هەژاریەتی تەواوی بێکەسدا دەنێت، لەهەمان کاتدا دەردێکی کۆمەڵایەتی دەخاتەڕوو، ئەو دەردانەی کە بێکەس بەوپەڕی تواناوە هەوڵی دەدا لەناو گەلدا نەیانهێڵێت، گۆران بچوکیەتی بێکەس لەسەردەمی خۆیدا دەخاتە ئەستۆی پایە کۆمەڵایەتییەکە، کە خەڵکی هەژار چەند لەهزردا دەوڵەمەندبووایە، بەبچووك سەیر دەکرا، دەوڵەمەندبوون لەلایان لەگیرفاندایە، نەك لەمێشکدا، وەك دەڵێ:

**بەڵێ بێکەس نابووت بوو/ جارجار برسی بوو، ڕووت بوو/ چونکە بێکەس بچووك بوو/ پایەی کۆمەڵایەتی سوك بوو**

٥-لەگەڵ خستنەڕووی ئەم سیما هەژاریەدا، گۆران سیفاتێکی بێوێنەی بێکەس دەخاتەڕوو، ئەم سیفاتەش ئەو ئەگەری ڕەشبینیەی کە لەسەریەتی ڕەتدەکاتەوە، بەوەی گەر ڕەشبینبوایە، ئەوا ئەو سووربوونەی لەسەر نیشتمان و گەل نەدەبوو، بەپێچەوانەوە دژایەتیشی دەکرد، لەبەرئەوە بێکەس چەند حەقیقەتێکی تاڵی خستوەتەڕوو، ئەمەش وەك باسکردنی دەرکە کۆمەڵایەتیەکانە لەلای بێکەس.

گۆران دەڵێ:

**وێنەی ئەو جوامێربوو/ بەرامبەر دوژمن شێربوو/ بێکەس بوو وەك پاڵەوان/ پەنجەی لەچاوی چەقان/ پەنجەی تیژی سەرزەنشت/ داخی دڵی خۆی پێرشت.**

٦-لەم چەند دێڕەدا گۆران ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی بێکەسمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە پەیوەندییان بە هەڵوێست و دڵسۆزی مرۆڤەوە هەیە و هیچ پەیوەندییەکی بەچێن و سیماوە نییە، بەمەش دەوڵەمەندی هەڵوێستی بێکەس دەخاتەڕوو:

**بەڵام کام تیر ، کام پۆستە/ وێنەی ئەو، ئەی فریشتە/ بێ باك وەستا بەرامبەر/ نوکی سونگی ستەمگەر؟**

نەك هەر ئەمەش، لەو ساتانەی کە مرۆڤ بیر لەخۆشی ناکاتەوە،

کەچی بێکەس نەیتوانیوە ئازادی لە بیرکات وەك:

**کێ وا: وا لەژێر زنجیرا/ ئازادی هات بەبیرا!**

٧-سودی هونەر: گۆران فەزڵی هونەرەکەی بێکەس بەرزدەکاتەوە، بەوەی هونەر بێکەسی کردبووە کەسایەتییەکی رووخۆش و ئیسك سوك، هەرئەمەش کەموکورییە سیماییەکانی داپۆشی بوو، بەمەش گۆران خۆی و شاعیرانی سەردەمەکەی دەکاتە کەسی بێکەس و لێرەشەوە وەڵامێك بۆ پرسیاری بێکەسییەکەی دەداتەوە، هەربۆیە پێشگری (بێ)ەکەی لێکردوەتەوەو بە (کەس) ناوی دەبات، وەك :

**هونەر بۆ رووخۆشی بوو/ کە خەوشی داپۆشی بوو/ بۆ شاعیرێك بێ کەس بوو/ بەڵام (کەس)، ئێمەی بەس بوو**

بەدەر لەمە گۆران لەساڵیادی کۆچی دوایی بێکەسدا، لەکانوونی یەکەمی ١٩٦٠دا شیعرێك بەناوی (یادی بێکەس) دەنووسێت و تێیدا دووبارە جەخت لەسەر ئەو حەقیقەتانە دەکاتەوە، کە لەشیعری پێشوودا نووسیبوونی.

١-لەبارەی خەبات و نیشتمان پەروەرییەوە: وەك دەڵێ:

**-هەرە برسی و هەرە لێ بووردووی دەستە/ (بێکەس) زیاتر، خەباتی خستە بەستە/ زمان برین سزای قسەی نەستەق بوو/ توانجی (بێکەس) بۆ دوژمن بەردی رەق بوو/ (بێکەس) دڵی بروای نەدا خامۆش بێ/ لەبەستەیا نیشتمان فەرامۆش بێ**

ئەم سووربوونەی گۆرانیش لەو هەژانە دەروونییەی بێکەسەوە سەرچاوە دەگرێ کە لەم چەند دێرەدا گڕی سۆزو خۆشەویستی نیشتمان هەرگیز لەناخیدا ناکوژێتەوەو بەردەوام لەپێناویدا دەژی، لەپێناو ژیانەکەش بەو شێوەنا، گەر کێشە نیشتمانییەکە چارەسەربکرێت، هەستەکان کاڵببنەوە لەلای بێکەس، چونکە جەخت لەسەر نەکوژانەوەش دەکات لەرێگای دژەکانییەوە، وەك دەڵێ:

**بەو خوایەی بێ شەریك و لامەکان و واحیدە/ عەشقی تۆ جۆرێ لەدڵما ئاگری کردۆتەوە/ ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی برژێنیتە سەر/ قەت گرو کڵپەو بڵێسەی تا ئەبەد ناکوژێتەوە**

٢-لەم شیعرەدا گۆران ئاواتی مانەوەو نەمری بێکەس دەخوازێت، لەپێناوی ئەوەی گەر لەدوای ئەم حاڵەتە بمردایە کە گۆران باسیان دەکات، ئەوا بەئارامیی لەگۆڕدا دەخەوت، وەك دەڵێ:

**-ئەمویست (بێ کەس) ئێستا بەسەر بژیایە/ ئەم گەرمیەی برایەتی بدیایە/ بیزانیایە گەوهەری نرخی (بێکەس)/ براکانی چۆن ئەیگێڕن دەساو دەس!**

لەگەڵ ئەمەشدا گۆران دڵخۆشی خۆی دەداتەوە، بەوەی زیندویەتی پەیوەست دەکات بەکارو بەرهەمەوەو دەڵێ:

**(بێکەس) ! لەشت با لەخاکا رزیبێ/ بامرۆڤیت بەیاسای مەرگ رازی بێ/ بەڵام بولبول کە ئامانجی لەم ژینە/ بەس خوێندنی بەستەی شیرین شیرینە!/ تاکو دەنگی چریکەی بێ لەسەردار/ هەرزیندووەو، هەر بولبولەو، هەر باڵدار/ کەوابێ تۆش تاکو (داری ئازادی)/ بەستەی کوردە، ئەژیت، نەمرێ یادی!..**

لەسەراپای ئەم دوو شیعرەدا گۆران شوناسێکی زۆر جوانی بۆ بێکەس خستوەتەڕوو، ئەویش بریتیە لەو مرۆڤە دڵپاك و دڵسۆزەی کە لەپێناو نیشتمان و خاکیدا، هەموو نەهامەتی و دەردەسەرێکی قبوڵکردو خاوەنی نەفسیەتێکی بەرزبووە لەم روانگەوە، جگە لەمەش ئەوەمان پێدەڵێ کە بێکەس بە بێکەسی مرد، بەڵام کەسێکی زۆری لەدوای خۆی بەجێهێشتووە، هەرچەندە لەو کاتەدا خەڵکی لەزمانی شیعرو خواستەکانی بێکەس نەدەگەیشتن، هەر ئەمەش کێشەی بۆ دروست کرد، بەڵام (داری ئازادی)ەکەی، وای لەخەڵکی کرد کە بەئازادانەو بەدەر لەهەموو پێوەرە کەسییەکان، بیری لێبکەنەوە، لێرەشەوە پێگەیەکی گەورەو جوانی بۆ خۆی پێکهێناوە.

## سەرچاوەکان


١-دیوانی گۆران-بەرگی یەکەم -محەمەد مەلا کریم-ل٨٣-ل٣٣٩.

٢-دیوانی بێکەس-ئومێد ئاشنا

٣-مێژووی ئەدەبی کوردی-عەللادین سجادی.

# بێکەس و شیعری مناڵان

تارا شێخ عوسمان

فایەق بێکەس، لەو شاعیرە مەزنانەیە کە بەهەستی نیشتمانپەروەری و چاونەترسی بەناوبانگبووە، هەمیشە گەلەکەی بۆ ئەوە هانداوە کە دژی چەوتی و تەماعکاری بووەستن و هاوکارو پشتیوانی یەکتری بکەن. بێکەس جگە لەنووسینی ژمارەیەکی زۆری هۆنراوەی نیشتمانی و نەتەوەیی و تەنانەت کۆمەڵایەتیش کە لەم هۆنراوانەیدا سەرجەم لایەنە جیاجیاکانی ژیانی کۆمەڵی کوردەواری ئەوکاتەی بەدەرخستووە، مناڵانیشی لەشیعرە جوان و بەپێزەکانی بێبەش نەکردووە، بەڵکو بەچاوێکی پڕ لەئومێد و هیواوە لێیڕوانیون و چەندین شیعری جوان و پڕ لەئامۆژگاری و پەندئامێزی بۆ نووسیون.

گەر لەهەندێ لەو شیعرانەی بڕوانین تێدەگەین کە ئەو شیعرانەی بۆ مەبەستی ڕوونکردنەوەی حیکمەتێك، بەڵام بەزمانێکی مناڵانەی سادە داناوە کە دیارترینیان شیعری(شێرۆ)یە کە لەڕۆژێکی زستانی ساردو سەرمادا مارێکی سڕدەبینێ لەکۆڵان و دەیهێنێتە ژوورەوەو بەزەیی پێدادێتەوە گەرمی دەکاتەوە، بەڵام هەر کەمارەکە بەوەی کە لەسروشتیدا گیاندارێکە مانای سۆزو خۆشەویستی نازانێ دوای گەرمبوونەوەی هێرش دەبات بۆ شێرۆ و دەیەوێ پێوەی بدات، بەڵام هەرزوو شێرۆ هانا بۆ باوکی دەبات و ئەویش دێت مارە سپڵەکە دەکوژێ. لەدوایدا بێکەسی شاعیر بەحیکمەتێکی کوردەواری، بە بەزمانێکی ئاسانی مناڵانە لە(شێرۆ)ی کوڕی و هەموو مناڵان دەگەیەنێت کە دەبێت مرۆڤ چاکە لەگەڵ کەسێکدا بکات کە شایەنی چاکەکردن بێت و ماناکەی بزانێت، کە ئەمەش بەشێکە لەئامۆژگاری مناڵان. هەروەك شیعرەکانی تری کە بۆ مناڵانی نووسیوە، بەهەمانشێوە لەجووتێ کۆترو بۆقێك و لەشیعری تەماعکاری کە حیکایەتی دوو پشیلە دەگێڕێتەوە کە چەندە تەماعکارن و پێکەوە ناتوانن پارچە پەنیرێك لەنێوان خۆیاندا لەت بکەن، چونکە کەسیان بەبەشی خۆیان ڕازی نین و کەسی سێیەم کەمەیمونێکە بەشدار دەکەن لەو بەشکردنەدا، ئەویش دوای لەتکردنی پەنیرەکە هەردووکیان بێبەش دەکات و لەمەشدا بێکەسی مەزن مناڵان لەوە وشیاردەکاتەوە کە چاوی تەماعکاریی زۆر شتێکی خراپەو ئەوەی کە بەبەشی خۆی ناڕازی بێت، سەرەنجام بێبەش و پەشیمان دەمێنێتەوە ئەوەش دەزانرێت کە شاعیر چەندین شیعری هاندانی بیری نەتەوەیی بۆ مناڵان نووسیوەو تێیدا مناڵان فێری ئەوە دەکات چۆن شانازی بەوەوە بکەن لەنەتەوەی کوردن و بەسەری بەرزەوە لەبەرامبەر دوژمنکارانیانداو بەدەنگێکی زوڵاڵەوە وەڵامی ئەوکەسانە بدەنەوە کە لێیان دەپرسن تۆ چیت؟! ئەوانیش بڵێن ئێمە کوردین، هەر بەزمانێکی سادەی مناڵانیش سووربن لەسەرئەوەی کە ترسنۆك نین و نەبەردن و چاونەترسن.

سەرەڕای ئەمانەش بێکەس چەند شیعرێکی فێرکاریشی بۆ مناڵان لەشێوەی مەتەڵ و یاری کردندا نووسیوە لەوانەش شیعرەکانی فڕۆکەو ژماردن، کە لەیەکەمیاندا واتە لەشیعری فڕۆکەدا دەڵێت:

شتێکە بێ خوێن و گیان.
دەفڕێ ئەچێتە ئاسمان.
هەڵدەگرێ گەلێ ئینسان.
دوباڵی پێوەیە جوان
ناویان ناوە تەیارە

زۆر مەحكوم و بەكارە

لەشەڕا موسیبەتە

لەئاشتیا نیعمەتە

لەسایەی حیرفەت و فەن

شتیوا دروست دەكەن

بێكەسی شاعیر، هەر لەو شیعرانەیدا كە بۆ منالآنی نووسیوە، زۆر جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە پێویستە منالآن باش لەوە بگەن كە یەكگرتن و پشتیوانی كردنی یەكتری تەنها ڕێگەیە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەكۆمەڵگەیەكدا بتوانێت بەئاسانی بەسەر كۆسپ و تەگەرەكانی ژیانیدا سەركەوێت و بەهەرەوەزی و هاریكاریی كردنی یەكتریشە كە دەتوانرێت سەختترین و ئاستەمترین كار ئەنجام بدرێ. لەدوو شیعری تریشدا بەناونیشانی(هەرەوەز و یەكێتی). ئەم دوو ئامۆژگارییە گرنگەی پێشكەش منالآن كردووەو هەوڵیشداوە كە زمانەكەی لەچیرۆك و بەسەرهاتە كوردییەكانی هەڵقولاو لەناخی كۆمەڵی كوردەواری وەربگرێ، كە شیعری(هەرەوەز) یەكێكە لەو شیعرانەی كە لەپرۆگرامی خوێندنەوەی كوردی خوێندنی سەرەتاییدا هەیەو زۆربەی زۆری منالآنی كورد پێی ئاشنان و ئەزبەریانە.

كەواتە ئەوەی ماوەتەوە بوترێ ئەوەیە كە پێویستە مامۆستایانی وانەی كوردی لەپۆلە سەرەتاییەكانەوە بەشێوازێكی سادەو روون و دوور لەبەكارهێنانی وشەو دەستەواژەی قورس، منالآن لەسەر ناسینی ئەم شاعیرە مەزنانە رابهێنن و باسی ژیان و بەرهەمەكانیان بۆ منالآن بكەن، بۆ ئەوەی یادی ئەم شاعیرانە بۆ ئەبەد لەلای سەرجەم نەوەكانی گەلی كورد هەر لەبەرزی و شكۆداریدا بمێنێتەوە، چونكە ئەم مەزنانە لەسات و سەردەمی خۆیاندا سومبولی گەشی مرۆڤدۆستی و دژایەتیكەرانی رۆژگاری رەشی میللەتی خۆیان بوون و هەمیشە هاندەرانی میللەتی كوردبوون بۆ گەیشتن بەئامانجی رەوای خۆیان لەپێناوی دروستكردن و هێنانەدی رۆژگارێكی رووناك و پڕ لەئازادی و رۆژگارێكی دوور لەچەوساندنەوەو گەندەڵی كۆمەڵایەتی بۆ میللەتەكانیان كە منالآنیش بەشێكی گەورەی ئەو میللەتەن.



سەرچاوە

دیوانی بێكەس، رێكخستنی(محەمەدی مەلا كەریم) چاپی سێیەم-چاپخانەی حەیدەری-سەقز-ئێران.



# پرشنگێك بۆ هەڵوێستێ و دەنگدانەوەیەك بۆ شێعر

ئەحمەد حسێن ئەحمەد

"ئەو کاتەی شیعر بەوتەو هەڵوێستەوە گرێدرا.. ئەو کاتەی بەندی و دوورخستنەوە بەغیرەت و هەڵوێستەوە گرێدرا.. ئەو کاتەی شیعری شۆڕشگێڕانە لەبەدەنی درەختی بڕوادا گەڵای سەوزو سەختی دروستکردو رووبەڕووی رەشەبای تۆقێنەر وەستایەوە، خونچەی بەئەمەك دەپشکوێ و هەناسەکانی بەختەوەری پەلدەهاوێژن و بێکەسی ماندوونەناسی رێبازی کوردایەتی و مرۆڤایەتیمان وەبیردێتەوە. ئەم کەسایەتییە دڵسۆزە، ناوی فایەق کوڕی عەبدوڵلا لەبنەماڵەی ئەلیاسە قۆجەیەو لەساڵی ١٩٠٥ لەشاری سلێمانی لەدایکبووە. هەر لەمنداڵییەوە زیرەکی و وریایی لێدیاریداوە. سەرەتا لەحوجرە خوێندویەتی و پاشان خراوەتە قوتابخانە و بە بەردەوامبونی لەخوێندندا بووە بەمامۆستا، پیشە پیرۆزەکەی بەشێوەیەکی پڕ لەسۆزو کاریگەرییەوە وتۆتەوە. لە ژیانیدا کارەساتی جگەر بڕی بەسەرهاتووە، کوێرەوەری زۆر چەشتووە، بۆیە لەشیعردا نازناوی بێکەسی بۆخۆی هەڵبژاردووە لەبۆتەی نیشتمانیدا تواوەتەوە. گەلێجار لەتۆفانی پەژارەدا پەنای بردۆتەبەر (مەی) تا تۆزێك لەدنیای ستەم و خامۆشی دووری بخاتەوە، وەك دەڵێت:

**حەقمە گەر عارەق بخۆم توخوا رەفیق لۆمەم مەکەن**

**زەحمەتە بێ (مەی) ژیانم بەم دڵە تاریکەوە..**

بێکەس لەهیچ ساتێکدا نیشتمان و گەلەکەی لەیادنەکردووە، بۆ نموونە لەپاڵ وێنەیەکی فۆتۆگرافیدا هزری هەوەڵ و دوایی خۆی دەردەخات، کە چەندە پەرۆشی یەکرێزیی کوردو خاکە دابەشکراوو هەڵقرچاوەکەی بووە:

**سیمام بۆیە واماتەو پڕ مەینەت**

**کورد سەرلێشێواو کوردستان لەتلەت**

دیسان وەك شاعیرێکی پێشکەوتووخواز ماف ئافرەت و کار کردنیانی شان بەشانی پیاوان پێباشبووە، بەشیعر بەرگری لە کێشە رەواکەیان کردووەو لەتای تەرازووی پیاودا دایناون:

**نێرومێ هەردوو بەجووتە بۆ وەتەن هەوڵێ نەدەن**

**دورە دەرچوونی لەدیلی مەل بەباڵێ نافڕێ..**

لەشوێنێی تردا ئاشکراتر پەردە لەڕووی ئەم مەبەستە هەڵدەماڵێت:

**نەسرین دەمێکە داخت لەدڵمە**

**گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە**

**هەستە تێکۆشە تاخوێنت گەرمە**

**سەرپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە**

بێکەسی پایەبەرز زاتێکی قسە خۆش و نوکتەبازو کۆڕ جۆشدەر بووە، دەڵێن کاتێ خوێندکاری ناوەندی بووە بۆ دەمکوتکردنی مامۆستایەکی عەرەب ئەم چوارینەیەی پێدەڵێت کەراڤەو شیکاری بکات، ئەویش دۆش دادەمێنێت:

**فتدر پرت أتواك ريشى كلها**

**وپيرنى الزمان شر تپير**

**فتلقلق ددانى درشت ووردها**

**فتكور عينى كپشت الاكور**

مامۆستا بێکەس بەرهەمی شیعری خۆی لەهەفتەنامەی ژیان و ژین و گۆڤاری گەلاوێژو بڵاوکراوەی تردا پەرەپێداوە. جگە لەوەش وتاری هاوچەرخی لەبارەی ئەدەبیات و وەرگێڕان و رەخنەوە نووسیوە. بەشێك لەشیعرەکانیشی تایبەتە بە منداڵانی کوردو هانیان دەدات بۆ خوێندن و دەستپاکی و خۆشەویستی وڵات. لەڕۆژی ٦ی ئەیلولی ١٩٣٠دا یەکێك بووە لە پێشڕەوانی خۆپیشاندانەکەو رێنمایی خەڵکی کردووە بۆ گرتنەڕێی کوردایەتی و خۆبەختکردن لەپێناوی ئازادیدا، بۆیە لەلایەن دەسەڵاتی داپڵۆسێنەرانەی پاشایەتی ئەو رۆژگارەوە دەستگیرکراوە، لەئەنجامدا زیندانی و دوورخستنەوەی بەسەردا سەپێنراوە، بەڵام هەرگیز وازی لەڕێبازە گەشەکەی کوردایەتی نەهێناوە، وەك دەڵێت:

**"من لەزیکرو فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێنەگەی**

**حەپس و تێهەڵدان و زیللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە**

**شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بدا**

**دوژمنت پەت کەم وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە..**

بێکەسی مامۆستاو رابەر بەو هەڵمەت و هەڵوێست و شیعرە شۆڕشگێڕانەیەوە پتر لەناو جەماوەردا دەرکەوت و بەشاعیرو تێکۆشەرێکی ئەمەکداری کێشە رەواکەی گەل ناسراو رێزی زۆری لێگیرا، بوو بە بێکەسەکەی کوردو کوردستان، چاکترین شاهیدیشمان تەرجیع بەندی قەسیدەی ٢٧ ساڵەیە کەڕووبەڕووی ئەدمۆندز وتویەتی و هەستی پوختی خۆی و نەتەوەکەی تیادا خستۆتەڕوو. بەمەیش رووکاری سەروەرانەتر لەبەرگی گزنگ و تریفەو ورشەدا پێبەخشرا، چەندانی تر شوێن پێی بێکەسیان هەڵگرت.

بێکەسی هاوڕێی نەمران، مامۆستایان ئەمین زەکی بەگ و پیرەمێردو سجادی و گۆران و برایم ئەحمەدو چوار ئەفسەرە لەسێدارە دراوەکە، دەیان قەڵەم و کەسایەتی تر کە یادگاری لەلای هەموویان بەجێهێشتبوو.. بەم هەیبەتە بڵندەوە لە ١٩٤٨/١٢/١٨دا هێشتا نەچووبووە پایزی تەمەنەوە نەخۆشی بێئامان تەنگی پێهەڵچنی و سەربەرزانە سەری نایەوە. لەدوای خۆی کچێکی بەئەمەك (گەزیزە خان) و کەڵە مێردێکی شیعرو هەڵوێستی بۆ گەلەکەی بەجێهێشت کە شاعیری گەورەو خاوەن قوتابخانەی شیعری نوێ و هاوچەرخ مامۆستا شێرکۆ بێکەسە. شیعرو نووسین بۆ ساڵیادەکانی بێکەس لەلایەن هاوڕێیانی و قەڵەمە بەهەڵوێستەکانەوە زۆر نووسراوە، هەموویان باس لەوەفاو غیرەت و دڵسۆزیی ئەو کەسایەتییە دەکەن و دەدوێن، لە لێکۆڵینەوەشدا لەچاو شاعیرانی تردا هەقی خۆی پێدراوە. نەمری بۆ بێکەس و ئەوانەی وەك خودی ئەو دەژین و بیردەکەنەوە.

"*بۆ نووسینی ئەم بابەتە کەڵك لەدیوانی بێکەس و چەند لێکۆڵینەوەیەك و هاوڕێیانی بێکەس وەرگیراوە."

# EY DILÊRAN

Ey dilêran, bêçûwa ēran
Besye helsin le xew wa beyane
Bo berzêtî qewmî kurd
Têkoîn dest û bird
Çawî lêtane dayîkî weten
Alem em ro her xerîke
Hawîl eda bo berzî jiyanî
Yek girin, pêkewin!
Paperin, serkewin!
Çawî lêtane dayîkî weten

Mektebe deramanî ê me
Xwêndina rehberî rizgarî
Helsin ey lawî kurd
Têkosin dest û bird
Çawî lêtane dayîkî weten

Çaresazan kar be destan
Bo cî wa mat û bêdeng û dûrin Obalî qewmî kurd
Le estoyî ê weye
Çawî lêtane dayîkî weten

# EY WETEN

Ey weten meftûn y tem û ēwatim bîr kewtewe
Wext y bendyî û esaret pê be tewq û ketewe,

Min le zikr û fikr y te xafil ne bûm wa tenegeyt,
Hepsî û tê heldan û zîlet tey le bîr birdetewe.

Bew xuwaye y bê ērîk û tak û tanya û bêkes e,
Eq̄ y tocorê le dilma agiry kirtotewe,

Agirek y wa hezar sal awy birjênîte ser,
Qet gir û kîlpe û bilese y ta ebed nekujetewe.

Bas y mehzûnî û kesasî y xot me ke tuxwa wetan. Çunke bew base birîn û zamekem ekûlêtewe,

Şert e ērt y piyawetî bê ger xuwa destim bida,
Duminit petkem weku seg bîxeme jêr pêtewe

*(Faîq Bêkes, Antolojiya Edebiyata Kurdî)*

## ŞAXÎ RENGAWRENGÎ GÔWIJE

Şaxî rengawrengî Gûwêje
Baisî keyf û sirûr
Herdema bergê epoē
Gah sipî gah sewz û sûr
Wesfî qewmî kurd ekey to
Bem hemû renganawa
Rengî sûrit āhide bo
Kurd ke qewmêke cesûr
Bergî bêgerd û sipît
Zahîre hawar eka
Qewmî kurd dilsaf û pakin Milletêkin bê qisûr
Bergî sewzît elê
Em xaka her īnayî ye
Pir le dexl û dan û kanî
Ser be rizq û pir le nûr
Ey weten āyanî fexrî
Wacibe methet bikem
Dar û berdid çeñî gewher
Xak û xolit wek bilûr.

*(Faîq Bêkes, Antolojiya Edebiyata Kurdî)*

# XWAYE WETEN AWAKEY

Xwaye weten awakey
Çend dilgîr û īrîne
Defî xo~û rengîne
Awî kewsere xakî gewhere
Pir le gul û nesrîne
Seyrangehî baharanî
Sewzegiyayî nerm û cuwanî
Sed dil ebê heyranî
Awî kewsere xakî gewhere
Pir le gul û nesrîne
Xaxî befrîn û berze
Bo rabûrdûman remze
Çîmenî ciwan û sewze
Awî kewsere xakî gewhere
Pir le gul û nesrîne
Em ūwêna ūwênî kurde Ceyî qehreman û merde Laneyî ērî neberde
Awî kewsere xakî gewhere
Pir le gul û nesrîne
Wetan çawî lê mane
Derîkeyn le tengane
Heyfa bête wêrane
Awî kewsere xakî gewhere
Pir le gul û nesrîne

*(Faîq Bêkes, Antolojiya Edebiyata Kurdî)*

# فایەق بێکەس و شیعری شار

تەلعەت تاهیر



کاتێ باس دێتە سەر ئەو شیعرانەی لە کۆن دا نووسراونو شەقڵی ژیانی شاریان پێوە دیارە، ئەوا حاجی قادری کۆیی و شێخ رەزای تاڵەبانی پێشەنگ دەبن، حاجی قادر کە لە ئەستەمبوڵ ژیاوە بیری ئازادیخوازانەو جەنجاڵیی مەڵبەندێکی گەورەی شارستانی ئەوسای وەك ئەستەمبوڵ کاریان لێ کردووەو دژی پەیوەندی‌یە کۆمەڵایەتی‌یە باوەکانی کوردەواری ئەوکات هەڵوێستی نواندووە، شێخ رەزایش هەرچەندە بە پیر بیری نەتەوایەتی نەچووە، بەڵام لە ستایش کردنی دەوڵەت و شاو وەزیرو کاربەدەستانی ئیداری‌دا لە بەکارهێنانی موفرەداتی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی تا ڕادەیەکی باش دوور کەوتۆتەوە، سەیر لەوەدایە نالی لە شیعرەکانی‌دا بە هیچ شێوەیەك رەنگدانەوەی ژیانی ناو شاری گەورەی پێوە دیار نی‌یە، ئەو شیعرانەی کە ئێستا لەبەردەستدان نایسەلمێنن کە نالی لە ئەستەمبوڵ ژیابێت!

لەشیعری نوێی کوردی‌دا نووسینی شیعری شار بە فایەق بێکەس بەستراوەتەوە، هەرچەندە بێکەس لە رووی شیعری‌یەوە دوور بوو لە جوانییەکانی زمان و تەکنیکی بەهێزو گرنگییەکی تەواوی بەماناو بابەت داوە. کە بێگومان زیانێکی زۆری بە شیعرەکانی گەیاندووە، بەشێوەیەك کە ئێستا وەکو دۆکیومێنتی مێژوویی حسێبیان بۆ دەکرێت. لەهەمان کاتدا و لەلایەکی دیکەوە شیعرەکانی بێکەس لەڕووی بەکارهێنانی موفرەداتی شارو نووسینەوەی جەنجاڵیی شار گرنگییەکی لە ڕادەبەدەریان هەیە. دوورکەوتنەوە لەو عیرفانییەتەی کە لادێ لەشیعردا هەیەتی و سەراپای شیعری کلاسیکی کوردی تەنیوە، یەکەم خەسڵەتی پۆزەتیڤانەی شیعری فایەق بێکەسە، بێکەس یەکەمین شاعیری کوردە کە پرسیارو گومانی دنیایی هەبێت، پێش ئەو گومان و پرسیاری عیرفانیانەی (مەحوی) جەستەی شیعری کوردی بوونو بێکەس دێت دڕدۆنگی دنیای رۆژانەو ئاڵۆزبوونی پەیوەندی‌یە ئینسانی و کۆمەڵایەتییەکان دەنووسێتەوە.

لای بێکەس چەمکی کوردایەتی و رۆمانسیەتی سۆفیگەرانە رەهەندێکی تازەیان لە شیعردا پێ دەبەخشرێت، لەبێکەسەوە ئیتر ململانێی خێرو شەڕ ئاراستەیەکی تر وەردەگرێ، کە دوور لە گەشبینی هەمیشەیی گوندنشینەکان شیعر پرسیاری موحریج لەکۆمەڵ و دەوروبەر دەکات.

